# تەوحید پێش تەجوید

چەند پەیامێک بۆ فێرخوازانی تەجوید و زانستی قیرائات

نووسینی

د. إحسان برهان الدين

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناساندنی کتێب

ناوی پەرتووک: تەوحید پێش تەجوید

نووسین: د. إحسان برهان الدین

نـەخـشەسازیی ناوەوە: عبدالله خاکی

نـەخـشەسازیی بەرگ: إخلاص دیزاین

نۆرەوساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٥ کۆچی – ٢٠٢٣ میلادی

چاپکردن : چاپخانەی گەشە (٠٧٥٠٨٨٢٩٠٨٦)

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە«١٦٧٢»ی ساڵی «٢٠٢٣»ی پێ دراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ
لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ **الزمر:٦٥**

# پێشەکی

الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّور ثُمَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ) والصلاة والسلام على سيدنا محمد وعلى آله و اصحابه و من تبعهم باحسان الى يوم الدين.

ئەم کتێبە لە بنچینەدا کۆمەڵە وتارێکە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاوکراونەتەوە، خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا ئەوەیە نووسەر دەیەوێت بڵێت: هاوکات لەگەڵ بایەخدان بە جوان خوێندنەوەی قورئان و گرنگیدان بە قیرائەتەکانی، پێویستە بایەخ بدرێت بە مەبەست و ئامانجی یەکەمی دابەزاندنی قورئان بەسەر پێغەمبەردا ﷺ کە ئەویش بانگەوازی تەوحید و جەختکردنەوەیە لەسەر جێبەجێ کردنی شەریعەتی رب العالمین، ئەوەش بزانرێت کە جوان خوێندەوەی قورئان و جێبەجێکردنی یاساکانی مەخاریج و سیفات هەمووی هۆکارە بۆ گەیشتن بە تێگەیشتنی مەعنا و واتاکان و کار پێکردنیان.

هەروەها نووسەر لە مەسەلەی زانستی قیرائات و تەجویددا، مەترسی خۆی دەخاتە ڕوو لەوەی کە ئەو زانستە لە وەسیلەو هۆکارەوە ببێتە مەبەست و ئامانج، چونکە ئەوە تێکدانە بۆ ڕیزبەندی و بایەخی ئەو فەرز و واجبانەی کە لەسەرمانە ئەنجامی بدەی.

الله عزوجل هەموو پێغەمبەرانی علیهم السلام بۆ ڕاگەیاندنی عەقیدەی تەوحید ڕەوانە کردووە و قورئان هەمووی بە ڕاستەوخۆ و بەناڕاستەوخۆ باسی ئیمان و تەوحید ئەکات و ئەوەش ئامانجی سەرەکی و پەیامی الله یە بۆ بەندەکانی، ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ مِنْ رَسُولٍ إِلا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلا أَنَا فَاعْبُدُونِ﴾[1]

زانستی تەجویدیش هۆکارێکی باشە بۆ ئاسان کردنی گەیشتن بەو ئامانجە، بەڵام هەر کاتێک خۆی لە خۆیدا بوو بە ئامانج و فێرخوازی زانست وای لێهات کە ئەوەی لە ئایەتەکانی قورئاندا سەرنجی ڕابکێشێت بە پلەی یەکەم حوکمەکانی تەجوید و مەخاریج و سیفەتی پیتەکان بێت، ئەوە زەنگی مەترسییە و شێواندانە بۆ ئەولەوییەتی کاری موسوڵمان.

پەیامی ئەم کتێبە ئەوە نییە لە گرنگی زانستی تەجوید و ئیجازە وەرگرتن لە قیرائاتی قورئانیدا کەم بکاتەوە، نەخێر، بەڵکە پەیامی ئەوەیە خوینەری قورئان هەمیشە و پێش هەموو شتێک دەبێت بیری لەلای پەیامی تەوحید بێت لە قورئاندا و بەردەوام لە واتاکانی قورئان وردببێتەوە و لەوە تێبگات کە قورئانی پیرۆز بەرنامەیەکە بۆ ژیان و عەقیدە شەریعەتێکی تێدایە بۆ ئەوەی هەموو مرۆڤایەتی کاری پێبکەین بە هۆیەوە بگەن بە بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ.

زانستی تەجویدیش دەبێت وەکو هۆکارێک بۆ ئەو مەبەستە بەکار بێت نەک خۆی بۆ خۆی ببێتە ئامانج و فێرخوازی زانست ساڵانی زۆر لەتەمەنی لەو زانستەدا بەسەر ببات،

[1] - الأنبياء: ٢٥.

بە کورتی دەبێت تەوحید بخرێتە پیش تەجوید و پێش هەموو شتێکی ترەوە، حدود و حوکم و سنوورەکانی قورئانیش دەبێت بخرێتە پێش حروف وسیفەت و جێگای دەرچوونی پیتەکانەوە .

داواکارم لە پەروەردگار ئەم نووسینە بکاتە مایەی سوود و وریاکردنەوەی موسوڵمانان بەگشتی و فێرخوازنی زانست بە تایبەتی وصلی الله وسلم و بارک علی سیدنا محمد وعلی آله و صحبه و من تبع نهجهم الی یوم الدین.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

احسان برهان الدین

سلێمانی/ گرین سیتی

٦ محرم ١٤٤٥/ ٢٤-٧-٢٠٢٣

# تەوحید پێش تەجوید!

ئەی ئەوانەی خەڵکی فێری جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز دەکەن! دەستان خۆش بێت و هەمیشە سەربەرز بن، کارەکەتان پیرۆزە بەڵام، تەرتیبەکەی تەواو نییە!

زۆر لە مامۆستایانی تەجوید و قیرائات، لە گەرمەی سەرقاڵیاندا بە بابەتە ورد و زۆرەکانی ئەو زانستەوە، بە تیۆری وکردەییەوە، وایان لێ هاتووە هەموو گرنگییەک تەنها بە بواری ڕواڵەتی و شێوازی جوانخوێندنەوەی قورئان دەدەن، من پرسیار دەکەم: ئێمە بۆچی پێویستە قورئان بە جوانی بخوێنینەوە؟! بێگومان بۆ خوێندن نییە لە پێناو خوێندندا! بێگومان بۆ ئەوەیە بە جوانی وڕوونتر لە واتاکانی بگەین و کاری پێ بکەین.

زۆرێک لەوانەی خەریکی ئەم بابەتەن بە مامۆستا و فێرخوازانەوە، بەسەر ئایەتەکانی عەقیدەو ئیمان و توحید و بابەتەکانی تردا تێدەپەڕن، ﴿إلا ما رحم ربي﴾ تەنها بیریان لای باسە جۆراوجۆرەکانی تەجویدە و وا تێگەیشتوون تەجوید ئامانجە و هۆکار نییە! بۆ نموونە لە ئایەتێکی وەکو: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ﴾ لە جیاتی ئەوەی بیریان لای مەرجی زانست بێت وەکو یەکێک لە مەرجەکانی (لا اله الا الله) و جێبەجێی بکەن لە خۆیاندا، دەبینی زیاتر بیریان لای دەرکردنی پیتی عەینە لە مەخرەجی ڕاستی خۆیەو پێدانی سیفەتی بەینیە پێی!

که ئایەتی ﴿لا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ دەخوێننەوە لە جیاتی ئەوەی مەسەلەیەکی گەورەو گرانی وەکو الولاء و البراء ی لەلا بوروژێنیت و بیری لێ بکاتەوە و خەم بۆ ئەو واقیعە بخوات لەو بارەوە کە موسوڵمانان تێیکەوتوون، هەموو خەم و بیرێکی لەلای تەحقیقی هەمزەی یؤمنون و، دەربڕینی مەددی بەدەل لە وشەی الآخر بەجوانی و، دەربڕینی مەددی لازم بەشەش جووڵەی تەواو لە وشەی ﴿يُوَادُّونَ﴾ دا بەبێ نوقسانی! بێگومان من لە گرنگی هیچ لەو حوکمە تەجویدییانە کەم ناکەمەوە، بەڵام فێربوونی تەجوید بچێتە جێگەی فێربوونی تەوحید بەڕاستی کارەساتە و دیاری لەوە گەورەتر نییە پێشکەشی نەیارانی ئیسلام بکرێت کە نەوەیەکی لەو شێوە پێبگەیەنرێت شارەزا لە تەجوید بێ ئاگا لە تەوحید!

خۆ کاتێک فێرخوازی زانست دەچێتە ناو عیلمی قیرائاتەوە، ئەوە ئیتر بواری بۆ فێربوونی هیچی تر نامێنیتەوە و پێویستی بەوەیە ڕۆژێک چل و هەشت سعات بێت بۆ ئەوەی بەباشی فریای فێربوونی ئەو هەموو زاراوە زۆرانەی ئەو زانستە هەیە بکەوێت بە نەزەری و بە عەمەلی، وەکو تەحقیق و ئیماله و تەقلیل و ئیشمام و حاڵەتەکانی هەمزە لەلای حەمزەو ئەوانی تر و تەوجیهی قیرائات و تەحریریان و...هتد

مامۆستایان، فێرخوازان: تەوحید پێش تەجویدە، کێشەی موسوڵمانان ئەمڕۆ لەوەدا نییە بنەماکانی تەجوید جێبەجێ ناکەن، کێشەیان ئەوەیە لە مەنهەجی قورئان وەکو عەقیدەو بیرو باوەڕ دوورکەوتوونەتەوە، بەداخەوە چەندین بەدیلی نامۆ بە مەنهەجی قورئان و سوننەتیشیان بەناو ئیسلامەوە

پێشکەش دەکرێت و لەبەر نەشارەزییان بە مەنهەجی قورئان ناتوانن پێی بزانن، لەبەر ئەو نەشارەزاییە خۆڵیان بە نرخی زێڕ پێ دەفرۆشرێت و پێیشی نازانن، تەجوید و قیرائات هەرگیز لە ڕووی لێشاوی تەغریب کردنی ئیسلام و ناشیرینکردنی بەرنامەکەی ناوەستێتەوە.

ئەو هەموو خولەی مانگانە و ساڵانە بەردەوام دەکرێتەوە، بەبێ ئەوەی خولێکی عەقیدە و تەوحید و دەستگرتن بە سوننەتی تێکەوێت، ئەوە پێچەوانەی پێویستی موسولمانانە، وەکو ئەوەیە کەسێک مەترسییەکی گەورە لەسەر ژیان و ماڵ و منالی هەبێت و زۆر پێویستی بەوە بێت خۆی بۆ ئەو مەترسیانە ساز بدات، تۆیش لە جیاتی ئەوەی ڕێگاکانی بەرگریکردن و خۆ پاراستن و قایمکردنی ماڵ و حاڵی فێر بکەیت، بچیت بە هەندێ قسەو باسی دوور لەو پرس و مەترسییەوە سەرقاڵی بکەیت و کاتیشی بۆ نەهێڵیتەوە بیرێک لەو پرسە ترسناک و مەترسیانەی خۆی بکاتەوە!

بە واتایەکی تر، تەوحید ئەسڵی پەیامەکەیە و بنچینەی ئەو بەرنامەیە کە الله تعالی مرۆڤی بۆ جێبەجێکردنی دروست کردووە، کە پێویستە لەسەری بژێت و لەسەری بمرێت، نەک بژێت و بمرێت و بەتەواوی لێی شارەزا نەبێت، ئەی ئەگەر نەیزانێت و پێی جاهیل بێت چۆن ئەتوانێت کاری پێ بکات؟ عەرەب دەڵێن: (فاقد الشيء لا يعطيه)! تێگەیشتن لە سنوور و حودودی قورئان زۆر گرنگترە و لە پێشترە لە تێگەیشتنی حوروف و پیتەکانی.

بە کورتی: ئەو مەنهەجەی سەبارەت بە گرنگیدان بە تەجوید و قیرائات لە کوردستاندا پەیڕەو دەکرێت مەنهەجێکی هەڵە و ئاوەژووە! ناهاوسەنگە و ئەولەوییەتی بە وەسیلە داوە لەسەر حیسابی ئامانج! ڕێک پێچەوانەی مەنهەجی زانستی و عەقیدەییە، چ دڵێک بە فێرخوازێک خۆش بکرێت وا

تێگەیشتبێت چوونە بەهەشت و بەرزبوونەوە لە پلەکانیدا و ڕزگاربوون لە دۆزەخ و ناخۆشییەکانی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی الله هەمووی بەستراوەتەوە بە جوان خوێندنەوەی قورئان و جوان دەربڕینی پیتەکان و جێبەجێکردنی جێگا دەرچوون و دەرخستنی سیفاتی پیتەکان! ئەوە هەڵەیەکە دوور نییە پلانێک بێت دوژمنانی ئیسلام بۆمانیان داڕشتبێت و ئێمە بێ ئاگا پەیڕەوی دەکەین، هەڵەیەکە پێویستی بە چاککردن و ڕێکخستنە، نەک لابردن، کەس خراپ لێم حاڵی نەبێت.

جەوهەری قورئان ئەو ڕێبازە عەقیدی و پەروەردەییە کە تێیدایە، نەک تەمەن لەگەڵ تەجوید و مەخاریج و سیفات و قیرائەتی فلان و ڕیوایەتی فلان تەواو بکەیت و وابزانیت هیچت نەهێشتووەتەوە، چونکە وەکو تێگەیشتن و پەیڕەویکردن لە مەنهەج و ڕێبازی قورئان تەنها ڕیوایەتی (حفص) بەسە و تا مردن پێویستمان بە هیچ قیرائیتێکی تر نەبێت، بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەدا کە موسیبەتەکان زۆر بوونە لەسەر موسوڵمانان و دینەیەکەیان پێویستی پێیانە بەرگری لێ بکەن. بەڵام پێویستە هەمیشە کەسانێکی بەتوانا و زانا بەو قیرائات هەمیشە خەریکی فێربوون و وتنەوەی بن، بۆ ئەوەی ئەو زانستە لەناوماندا هەمیشە بمێنیت و نەبڕێتەوە، نەک هەموان ڕووی تێبکەن و واز لە فێربوونی عەقیدەو تەوحید و بیروباوەڕ و فێربوونی سوننەت و دوورکەوتنەو ە لە بیدعە بهێنن!

مامۆستایان و فێرخوازانی بەڕێزی زانستی تەجوید و قیرائات:

وریا بن ئەم مەسەلە تا بڵێی هەستیارە و شایانی بایەخ پێدانە.

اللهم هل بلغت. اللهم فاشهد.

## پەیامێك بۆ فێرخوازانی تەجوید و قیرائات

پاش ئەوەی ساڵانێک موسوڵمانی کورد و تەنانەت مامۆستایانی ئایینیش نەیاندەزانی بەجوانی قورئانی پیرۆز بخوێننەوە، ئێستا بە شێوەیەکی بەرچاو دەبینرێت موسوڵمانان بە بەهەردوو ڕەگەزەوە ڕوویان کردووەتە فێربوونی تەجوید و زانستی قیرائات، منیش وەکو ئەوەی شارەزاییم لەو زانستانەدا هەیە و قیرائاتی قورئانیم خوێندووە و چەندین کتێبم لەو بوارەدا نووسیوە وەکو شەرحی (المقدمة الجزرية) و وەرگێڕانی کتێبی (معجم مصطلحات علم القراءات) کە هەردوکیان چاپ کراون و هەروەها چەندین خول و دەیان وانەی دەنگی وڤیدیۆییم لەو بارەوە هەیە، بە پێویستی دەزانم پێتان بڵێم:

١ - هەر زانستێک پەیوەندی بە قورئانی پیرۆزەوە هەبێت زانستێکی پیرۆز و باشە، بۆیە بایەخدان بە تەجوید و قیرائاتی قورئانی لە سنووری خۆیدا کارێکی باشە و خێرەو بە سوودە، هۆکارێکی پێویستە بۆ چاکتر تێگەیشتن لە قورئان و واتاو پەیام و ڕێبازەکەی.

٢ - دەبێت هەرگیز ئەوەت لەبیر نەچێت کە ئەولەویەت بۆ تێگەیشتن و کارکردنە بۆ پەیام و ناوەڕۆک مەنهەجی قورئانی پیرۆز لە عەقیدەو شەریعەتدا، تەجوید وەسیلە و ڕێگاو هۆکارە بۆ تێگەیشتنی بەرنامەی قورئان، نەک خۆی بۆ خۆی مەنهەج و مەبەست و ئامانج بێت! ئەم مەسەلە شایانی لێوردبوونەو بایەخ پێدانە چونکە لە کوردستاندا خەریکە ئەو مەسەلە ئاوەژوو دەبێتەوە.

٣ – پاش ئەوەی ساڵانێک خۆم لەم بوارەدا ئیشم کردووەو ئێستەش هەر دانەبڕاوم، دەتوانم بڵێم: هەوڵێک هەیە بۆ بەلاڕێبردنی زانستی تەجوید و قیرائات و لابردنی لەسەر ڕێڕەوی خۆی، لە ڕاستیدا ئەگەر گرنگیدانی خەڵکی ومامۆستایانی ئایینی و ڕێکخراوو ناوەند و قوتابخانەو سەنتەرەکان بەم بابەتە و ڕۆچوون تێیدا بە شێوەیەک کە بە پلان و بەرنامە وەرگرتنی ئەو زانستە درێژە خایەن و دوور مەودا بێت و فێرخوازی زانست فریای زانستی تر نەکەوێت و هەر خەریکی ئەوە بێت، لەو حاڵەتەدا دوور نییە ئەوە پیلانێک بێت و دەستی ناحەزانی ئیسلامی لە پشتەوە بێت، چونکە ئەوان ئەوەیان دەوێت موسوڵمانان تەنها خەریکی مەخاریج و سیفات و ئەحکامی جوان خوێندنەوەی قورئان و خیلافی قاریئەکان سەبارەت بە فەتح و ئیمالەو سەکت و مەدد و قەسر و ئیشباع و ئیشمام و ئیدغامی بچووک و ئیدغامی گەورەو تەسهیل و تەحقیق و ئوسوڵ و فەرش و سەدان باسی تر بێت، کەتەمەن تەواو دەبێت و ئەو باسانە تەواو نابن، بەتایبەتی کە ئەو زانستە دوو لایەنی هەیە نەزەرەی و کردەیی، دواجاریش سوودێکی زۆری بۆ کێشەکانی موسوڵمان لەم سەردەمەدا نییە و ناحەزانی ئیسلام پێیان خۆشە هەموو موسوڵمانان بەو باسانەوە سەرقاڵ بن و بەلای باسەکانی عەقیدەو تەوحید و ئیمان و سوننەت و فەرموودەدا نەچن و لە بابەتە جەوهەرییەکانی دینەکەیان هەمیشە بێ ئاگابن.

٤ – کێشەی ئەمڕۆی موسوڵمانان بە گشتی و کورد بە تایبەتی لە جەهلیانە بە عەقیدە و ئیمان و مەنهەجی ڕاست و درووستی دینەکەیان، کێشەیان لە جوان خوێندنەوەی قورئاندا نییە، بەڵکو کێشەیان لە شوێنیکی ترە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێک لە مەعناو حوکمەکانی سوڕەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ بە باشی تێبگات، هەڵەش لە خوێندنەوەیدا بکات ئەوە نابێتە ڕێگر لەوەی تەوحیدی ئولوهیەت و ربوبیەت و ئەسمائو سیفاتی بۆ پەروەردگاری ئەنجام بدات.

٥ – مەسەلەی تەجوید زۆر مەسەلەیەکی گرنگە ودەبێت موسوڵمان تا بۆی بکرێت فێری ببێت، ئەگەریش هەر نەیتوانی فێری ببێت کێشە نییە، چۆن پێی دەکرێت قورئان بخوینێت با ئاوها بیخوێنێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ الله تعالی داوای ئەنجامدانی کارێکمان لێ ناکات لە سەرووی توانای خۆمانەوەبێت، بۆیە ئەگەر موسوڵمان هەوڵی خۆی بدات و سەرەڕای هەوڵەکانی هەر نەتوانێت فێری تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئان ببێت، نەک گوناهبار نابێت لەوانەیە دوو بەرانبەری ئەو کەسەی شارەزای تەجویدە خێریشی بۆ بنووسرێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الماهر بالقرآن مع السفرة الكرام البررة، والذي يقرا القرآن ويتتعتع فيه وهو عليه شاق له اجران)[1] واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا شارەزا لە قورئاندا لەگەڵ مەلائیکەتە بەڕێزەکاندایە، ئەو کەسەش کە قورئان دەخوێنیت و قورسە لەسەر زمانی و ناتوانێت بەجوانی بیخوێنێتەوە، دوو پاداشتی هەیە، واتە پاداشتێک لەسەر خوێندنەوەکەی، پاداشتێکیش لەسەر زەحمەتەکەی.

[1] - رواه مسلم.

٦- بە هیچ شێوەیەک ئامۆژگاری هیچ فێرخوازێکی زانست ناکەم لەپاش شارەزابوونی لە مەخاریج و سیفاتی پیتەکان و شارەزابوون و جێبەجێکردنی ئەحکامی تیلاوە وتەجوید و وەرگرتنی ئیجازە لە ڕیوایەتی (حفص) یان لە قیرائەتی (عاصم) کە تاکو ئێرە ئەمانە زۆر پێویستن و بەباشی نازانم موسوڵمانان بە گشتی لەوە زیاتر بڕۆن لەو ڕێگایەدا، مەگەر فێرخوازێک زۆر بەهرمەند بێت و لەو زانستەدا حەز و توانای تایبەت وجیاوازی هەبێت، جگە لەو حاڵەتە پێم باش نییە فێرخواز بەردوام بێت لە تەواو کردنی هەموو قیرائەتەکان و تەواو کردنی قیرائاتی سەبعە و عەشرە لە ڕێگەی (الشاطبیة و الدرة)و ئینجا بڕواتە سەر (الطیبة) و بەوەشەوە نەوەستێت بیر لە خوێندنی (شواذ) ی قیرائات بکاتەوە، لە ڕاستیدا بۆ ئەم سەردەمەی خۆمان هەموو ئەوانە زیادن و پێویست ناکات موسوڵمان کاتی خۆی بەو زانستانەوە بەسەر ببات، چونکە لەوانە زۆر گرنگتر و لەپێشتر هەیە و تەمەنیش کەمە و دیاریکراوە و دەبێت ئەوەی کە بۆ بەهێزکردنی دین و ئیمان موسوڵمان پێویستە بۆ خۆی و بۆ خێزان و بۆ دەوروبەری و بۆ ئەو خەڵکەی کە لە ئیسلامی ڕاستەقینە دوورکەوتونەتەوە ئەجامی بدات.

٧- ڕێگەی فێربوونی زانستی قیرائات لە کوردستاندا ڕێگەیەکی هەڵەیە لە ڕووی زانستییەوە، بۆ نموونە زۆربەی وەرگرتنی ئیجازە بەبێ لەبەر کردنی قورئانە و بە خوێندنەوەیە لە مصحف، ئەوەش پێچەوانەی ئەوەیە سەرانی ئەم زانستە لە درێژایی مێژووی ئیسلامدا ئەنجامیان داوە و تەنانەت ئێستاش لەو وڵاتانەی گرنگی بەم زانستە دەدرێت وەکو میسر و شام و مۆریتانیا و وڵاتانی تر بەبێ لەبەر کردن بەهیچ شێوەیەک ئیجازە نادرێت.

ئینجا شارەزابوونی تۆکمە و تەواو لە زمانی عەرەبیدا لە ڕووی نحو و صرف و بلاغة و زانستەکانی تر، بڕبڕەی پشتی قیرائاتە و بەبێ ئەو شارەزابوونە تەنها خۆ خەریک کردنە، ئەمڕۆ کەسانێک نەک ئیجازەی عاصم و نافع و حمزة و کسائی یان هەیە و ڕەنگە (قل و فل) ی عەرەبی لەیەک جیانەکەنەوە، بەڵکو هەن کە عەشرەیان هەیە و ئاستیان لە عەرەبیدا ئاستی خاوەن ئیجازەی عەشرە نییە و زۆر کزو لاوازە، ئەوە تێکدانە بۆ بنەماکانی ئەو زانستە کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا دەکرێت، کەسێک لاواز لە زمانی عەرەبی چۆن لە تەوجیهو لە تەحریر و لە حاڵەتەکانی یەککگرتنی هەمزە و ئەو هەموو شێوازەی کە لە خوێندنەوەی هەندێ ئایەتدا هەیە و هەروەها چۆن لە ئیعرابی قیرائات وچەندین مەسەلەی پەیوەندیداری تر تێدەگات، ئێ کە تێنەگات چ دڵێکی بەو ئیجازە خۆشە؟

٨ – نەخۆشی و درمێکی خراپ هاوکات لەگەڵ گرنگیدان بە زانستی قیرائات سەری هەڵداوەو لەوانەشە هۆکاری گرنگیپێدانەکەش هەر ئەوە بێت، ئەویش حەزی بەدەستهێنانی ئیجازەیە، لە ڕاستیدا ئیجازەی قورئانی لە کوردستتاندا بایەخێکی زانستی ئەوتۆی نییە، چونکە نەک ئەو کەسەی کە ئیجازە وەردەگرێت، بەڵکو بەداخەوە هەندێ جار ئەوەشی کە ئیجازە دەدات شارەزایی تەواوی لەو زانستەی کە موجازە تێیدا نییە.

٩- داوا دەکەم لە هەموو ئەو خوشک و برا بەڕێزانەی سەرقاڵی خوێندن و فێربوونی ئەم زانستەن، با لە ضبط کردنی مخارج و صفات و احکام و ئیجازە وەرگرتن لە عاصم زیاتر نەڕۆن و هەوڵ و کۆشش بدەن کە ئەو بابەتانە بە جوانی تێبگەن و جێبەجێی بکەن. لە دوای ئەوە و لە جیاتی بەردەوام بوون لەو ڕێگە دوورە و پڕ لە زەحمەتە لە فێربوونی قیرائات، بچن دیراسە و تەفسیری قورئان بخوێنن و لە بەرنامەکەی تێبگەن، بچنە سەر کتێبەکانی عەقیدەی سەلەف و ئەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەوان بوونە لە شوێنکەوتوانیان و شەرحەکانی ئەو کتێبانە بخوێننەوە، بچنە سەر کتێبەکانی فەرموودەو سوننەت و شەرحەکانیان، بچنە سەر کتێبە باشەکانی تەفسیر و زانستەکانی تر وەکو تەفسیری الطبري وابن كثير والبغوي، بچن فێری زمانی عەرەبی ببن کە کلیلی تێگەیشتنە لە هەموو زانستەکان و بەبێ فێربوونی زمانی عەرەبی.

١٠- ئەوەندی کە بۆم دیاری کردی لە تەجوید و لە قیرائات بەسە بۆ ئەوەی لە کتێبی پەروەردگارت بەباشی تێبگەیت و عیبادەت و نوێژ و شەونوێژ و فێرکردنی موسوڵمانانی پێ بکەیت و بە نەزانینی قیرائاتی دوای عاصم یەک کێشەت لە دینداریدا هەرگیز بۆ درووست نابێت، بەڵام بەشارەزا نەبوون لە تەفسیری قورئان، لە نواقض الشهادتين، لە الولاء و البراء، لە نەشارەزایی لە مەسەلەی ﴿الحكم بغير ما انزل الله﴾، لە کتێبەکانی فەرموودە و سوننەت، کێشەو کەلێن و نوقسانی گەورەت لە دین و لە دونیادا بۆدرووست دەبێت.

١١- حەقیقەتێک هەیە ڕەنگە زۆر لەوانەی سەرقاڵی ئەم زانستەن دانی پێدا نەنێن ونکۆڵی لێ بکەن، بەلام من زۆر دڵنیام لێی و بە ئەزموونی خۆم لە گەڵ خوێندکاران و قسە کردن لە گەڵ مامۆستایانی ئەم زانستە لێرەو لە دەرەوەی کوردستان و عێراق کە چاوم پێکەوتوون وهەروەها لە ڕێگەی خوێندنەوەو ئەزموونی کەسی خۆم لە وانە وتنەوەدا، ئەو حەقیقەتەش ئەوەیە کورد ناتوانێت لە زانستی قیرائاتدا ئاستی بەرز بێت و قۆناغی باش ببڕێت، ئامادەیی پێویستی وەکو کوردێک تێدا نییە بۆ وەرگرتنی ئەو زانستە و ئەوەش هیچ عەیب و نوقسانییەک نییە تێدائەوەی کە هەیە ناڵێم هەمووی زۆربەی هەر ئیجازە کۆکردنەوەیە لە ڕاستیشدا ئەگەر فێرخوازی قیرائات بابەتە زۆرەکانی ئەو زانستە ضبط نەکات و بە شێوەکی کردەیی نەتوانێت جێبەجێی بکات سەد ئیجازەشی هەبێت هیچ سوودێکی نییە، بەداخەوە زۆربەی ئەوانەش کە ئیجازە کەڵەک دەکەن لە کوردستاندا لەو جۆرەن، بەڵام گومانی تێدا نییە کە مامۆستا و خەڵکی شارەزاشی تێدایە بەڵام بەراود بەو لێشاوە لە خاوەن ئیجازەکان دەگمەن و کەمن.

١٢- ئەم تێبینی و ڕەخنانە بۆ ئەوانەیە کە خۆیان تێکداوەو سەرقالی زانستی قیرائاتن و شەو ڕۆژیان بەدەم یەکەوە بەستووە و ئەوپەڕی توانای خۆیانیان لە کۆکردنەوەی سەنەد خەرج کردووە و لە زانستەکانی تر دوا کەوتوون وکڵۆڵ ن، کە وەکو وتم لە زانستەکەی خۆیشیاندا ئەستەمە زۆر شارەزا بن.

١٣ – ئەگەر کەسێک هەرچی بنەماکانی ئەو زانستە هەیە وەکو ناوی خۆی لەبەری بکات و بیزانێت، ئەگەر هەموو قیرائات بە ئوسوڵ و بەفەرشەوە بتوانێت بە حفظ جێبە جێ بکات، دوا جار بە نیسبەت عامی خەڵکەوە ئەو وئەو کەسەی تەنها ئیجازەی لە ڕیوایەتی حفص دا هەیە وەکو یەکن، بەڵام ئەگەر کەسێک بۆ نموونە شەش کتێبە سەرەکییەکانی فەرموودەی تەواو کربێت و هەندێ لەشەرحەکانی خوێندبێتەوە، کتێبەکانی سوننەت وعەقیدەی سەلەف ی وەرگرتبێت ، یان کتێبەکانی ابن تیمیة و ابن القیم ی خوێندبێتەوە و زۆرێک لە باسە گرنگەکانی مجموع الفتاوی بزانێت، ئەگەر کتێبەکانی بیروباوەڕ و تەوحیدی زانایانی نەجد و زانایانی تری عەقیدە ڕاست و پاک شارەزا بیت، ئەگەر لە حالی فیرقە و تاقمەگومڕانی سەردەمانی کۆن و هاوچەرخ حاڵی بووبێت و لە حەقیقەتی مەترسیی و چەواشەکاریەکانیان تێگەیشتبێت و لە مەترسی بەناو قورئانی ودژە سونەتەکان و عەلمانی و قەومی و مارکسی و سەرانی گومڕاکەرانی ئەم سەرەمە بۆ خۆی ئاگادار بێت وموسوڵمانانی لێ وریا بکاتەوە، ئەگەر ئەوانەی کردبێت، ئەوا جێگەی خۆیەتی ئینجا بچێتەسەر قیرائاتی قورئانی و بە تەواو کردنی قیرائات لەسەر الشاطبیة و الدرة ش نەوەستێتەوە، بەڵکو بچێتە سەر ڕێگەی (طیبة النشر) و (شواذ) ی قیرائاتیشی بخاتە سەر چونکە کەسێک بەو شێوە بێت ئەو توانایەی هەبێت ئەوە مافی خۆیەتی لەو زانستەش مەحروم نەبێت و فێرخوازی زانست لە وەرگرتنی زانست تێرخواردنی نییە، بەڵام ئایا کەسی وا لە کوردستان هەیە؟

١٤ – زانستی قیرائات لە دێر زەمانەوەو لە درێژایی مێژووی ئیسلامدا زانستی خەڵکە تایبەتەکان بووە و هەمیشە کەسانیکی کەم تێیدا هەڵکەوتوون و پسپۆڕییان تێیدا وەرگرتووە، هاوکات خەڵکانێکی زۆریش نانیان پێوە خواردووەو هۆکارێکی بەرژەوەندی و پارە پەیدا کردن و بەدەستهێنانی شوهرەت و ئەو حاڵەتە خراپانەیە کە هەندێکیم لە کتێبی شەرحی (زغل العلم)ی پێشەوا الذهبي خستووەتە ڕوو، بۆیە کە خەڵکانێکی زۆر و بەبێ شایستەبوونی زانستی ڕوو بکەنە ئەو زانستە، ئەو کارەساتەی زەهەبی لە (زغل العلم) دا باسی دەکات دووبارە دەبیتەوە و، ئێستاش بەداخەوە لە کوردستاندا زۆر بە زەقی ئەو هەڵە و خراپ کەڵک لێ وەرگرتن و کارە نەخوازراوو ناشەرعییانە لەم زانستەدا دەرکەوتووە.

١٥– ئەگەر هەر ڕازی نەبیت و بڵێیت من هەر بەردەوام دەبم لە قیرائات بێ ئەوەی لە زانستە پێویستەکانی تر خۆم شارەزا بکەم، ئەوا پێت دەڵێم:

– هەوڵ بدە تەجوید و قیرائات تێکەڵ بە عەقیدەو ئیمان بکەیت و وەکو زانستێکی ساردوسڕ پەتی نەیخوێنیت و نەیڵێتەوە، کە گەیشتیتە هەر ئایەتێک جگە لە حوکمەکانی تەجوید ڕەهەندی عەقیدەو ئیمانی تێدا بوو بوەستە لەسەری و ڕوونی بکەرەوە: بۆ نموونە کە دەگەیتە ئایەتی ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ لەسەری بوەستە و با ئەوەت بیر بخاتەوە ئێستا بەناو ئیسلامەوە کەسانێک دەڵێن (ان الحكم الا للشعب)، کە گەیشتیتە ئایەتی: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ یان ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ﴾ یان ئایەتی:

﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ يان سورەتێکی وەکو سورەتی الأنفال والتوبة و الأنعام بەوردی بیخوێنەوەو لە مەعناکانی تێبگە، سورەتی محمد و الممتحنة ودەیان و سەدان ئایەتی تر تەنها کەمێک بیر لە مەعناکانیان بکەیتەوە زۆر شتت بۆ دەردەکەوێت و لە واقیعی تاڵی ئەمڕۆمان تێدەگەیت کە چەند لە ئیسلامی کیتاب و سوننەتەوە دوورە و لەوانەشە لەو کاتەدا لەوەش تێبگەیت بۆچی هەموان هانی گەنجان دەدەن تەنها خەریکی تەجوید و قیرائات و خولی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز بن؟.

به کورتی من پێتان دەڵێم: ئەو قورئانەی کە خەریکی فێربوونی (حروف)ەکانین، نابێت لە (حدود)ە کانی بێ ئاگا بن، ئەگەر (تجوید) لە قورئاندا یەک جار گرنگ و پێویست بێت، ئەوا (توحید) لە هەمان ئەو قورئانەدا سەد جار پێویستە و ئامانج و مەبەستی قورئانە، لە کاتێکدا جوان خوێندنەوەی قورئان و قیرائات هۆکارێکە بۆ باشتر تێگەیشتن لەو پەیامەی الله تعالی بۆمانی ناردووە نەک ئامانجی کۆتایی بێت.

الله تعالی لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلا﴾ زانایانی قیرائاتیش بەپێی ئەم ئایەتە و هەندێ بەڵگەی تر فێربوونی تەجویدیان بە واجب زانیوە، وەکو (ابن الجزري) ش لەو بارەوە فەرموویەتی:

والأخذ بالتجويد حتم لازم *** من لم يجود القرآن آثم

واتە: کارکردن بە تەجوید مەسەلەیەکی حەتمییە و دەبێت بە ڕەچاوکردنی حوکمەکانی جوانخوێندنەوەی قورئان بێت، بەهەمان شێوە لە هاوچەرخەکاندا المرصفي لە سەر ئەو بۆچوونەیە،

بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە چەند تێبینییەکی لەسەرە و پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە:

یەکەم: ئەمە بۆچوونی هەموو زانایان نییە و بۆچوونی تریش لە کۆن و نوێدا هەیە کە فێربوونی وردەکاری تەجوید تەنها بە مستحب ئەزانێت نەک بە واجب، ترتیل یش بە مەعنای جوان خویندن و لەسەر خۆ خۆ و بە ئارامی خوێندنی قورئانە و ئەوەندەی واجبە کە حەرەکاتی وشەکان بەجوانی دەربریت و هەڵەیان تێدا نەکەیت، وردەکارییە زۆرەکانی تر بەبێ زیادەڕەوی بکرێت کارێکی باشە و نەکرێت لە پاداشتی خوێندنەکە کە ناکاتەوە و نابێتە کێشە.

دووەم: حوکمی واجب بوون لە حاڵێکدا ئەگەر پەسەندیش بێت حوکمێکی ڕەها نییە و وکو زانایان فەرموویانە على الكفاية یە و تایبەتە بە کەسانێک کە کات وتوانای فێربوونی ئەو هەموو وردەکارییەیان هەبێت و فێرخوازی زانست بن.

سێیەم: بە واجب تەماشا کردنی فێربوونی ئەحکامی تەجوید کە وردەکاری تیۆری و کردەیی زۆری تێدایە، جۆرێک لە لەبەرچاونەگرتنی حاڵی خەڵکانێکی زۆر بەڵکو زۆرینەی خەڵکی تێدا بەدی دەکرێت کە لەبەر زۆر هۆکار ناتوانن فێری ببن، لە ڕاستیدا بەواجب دانانی فێربوونی حوکمەکانی تەجوید وەکو ئەوەیە هەموو موسوڵمانان بە فێرخوازی زانست و تەلەبەی عیلم حساب کرابن و هەم لە ڕووی کات و هەم لەرووی توانای زانستی وزماندا هیچ کێشەیەکیان نەبێت و مەسەلەکەش اوا نییە.

چوارەم: ئینجا لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الَّذِي يَقْرَأُ القُرْآنَ وَهُو ماهِرٌ بِهِ معَ السَّفَرةِ الكِرَامِ البَرَرَةِ، وَالَّذِي يقرَأُ القُرْآنَ ويَتَتَعْتَعُ فِيهِ وَهُو عليهِ شَاقٌّ لَهُ أَجْرانِ)[١] لەم فەرموودەش دەردەکەوێت کە ئەو کەسەی کە هەوڵی خۆی ئەدات بۆ جوان خوێندنەوەی قورئان و ناتوانێت ئەوە دوو پاداشتی هەیە پاداشتێک بۆ خوێندنەوەکەی و پاداشتێک لەسەر ئەو ماندووبوون و عەزێتەی کە لە هەوڵدانی جوان خوێندنەوە تووشی ئەبێت و ناتوانێت.

پێنجەم: بۆچوونی بە واجب زانینی زانستی تەجوید لەسەر موسوڵمانان تایبەتە بەهەندێک لەزانایانی تەجوید و قیرائاتەوە، بەڵام فوقەها وشەرعناسەکان لە کۆن و نویدا لەسەر ئەوەن کە موسوڵمان ئەگەر سەر وژێروبۆر لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا ڕەچاو بکات مافی ئایەتەکەی داوە و جگە لەوە لە ئەحکامی تەجوید (مستحب) ە و کارێکی باشە و جوانە ڕەچاوی بکات، ئەم بۆچوونە زۆربەی زۆری زانایان دێرین وئەوانەی لەم سەردەمە لەسەرین، بەڵکو وتوویانە ڕۆچوون و زیادەرەوی لە جەختکردنەوە لەسەر جێبەجی کردنی وردەکاری تەجوید جۆرێکە لە تکلف و زۆر لە خۆکردن کە ئەوەش کارێکی باش نییە وقەدەغەیە لەشەرعدا وەکو الله تعالى فەرموویەتی: ﴿وَمَا أَنَا مِنَ الْمُتَكَلِّفِينَ﴾.

[١] - متفقٌ عَلَيْهِ.

شەشەم: پێشەوا الذهبي ش لەو بارەوە لە کتێبی (زغل العلم) و شوێنی تر لە کتێبەکانی، بێزاری زۆری نیشانداوە لەو خوێنەرانەی زۆر لە خۆیان ئەکەن و تەکەلوف ئەکەن و ڕەخنەی زۆری لێگرتوون و تەنانەت بە هەندێ خوێنەری قورئانی لەو جۆرە کە ئاماژەمان پێکرد دەڵێت: (لا صبحک الله بخیر، انک حجر منجنیق ورصاص علی الأفئدة)، هاوچەرخەکانیش بەهەمان شێوە ئەو وردەکارییە دوورودرێژانەی کە بە زۆربەی خەڵک و فێرخوازانیش ناکرێت بە (تنطع) و زیادەڕەوی ئەژماریان کردووە و فێربوونی تەجوید جگە لە مەسەلە بنچینییەکانی بەواجبیان نەزانیوە و بەکارێکی (مستحب) تەماشایان کردووە، چونکە وتوویانە ئەسڵ ئەوەیە لێی تێبگەیت و بیر لە واتاکانی بکەیتەوە و لەکاتی خوێندنەوەدا ڕەچاو و موراعاتی سەروژێر و بۆر بکەیت وتەواو.

حەوتەم: بەڵگەش لەسەر ئەوەی خوێندنەوەی قورئان بەو شێوە گران نییە کە هەندێ وێنای ئەکەن ئەوەیە بە حەوت شێوە دابەزیوە بۆ ئەوەی خەڵکی بەکامیان توانیان و بۆیان ئاسانتر بوو بەو شێوە بیخوێننەوە و الله تعالی فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾[١]. بەڵام ئەگەر گوێ بۆ هەندێک بگریت لە مامۆستایانی تەجوید و قیرائات بە شێوەیەک قورسی ئەکەنەوە کە کەم کەس ئەتوانێت بەو شێوە دەریبکات و ئەمەش وای کردووە هەندێک لە زانایان ڕەخنە بگرن و ئەوە بە زێدەڕەوی بژمێرن و بەجۆرێک لە دوورخستنەوەی خەلکی لە قورئان دابنێن.

[١] - القمر:١٧.

هەشتەم: ئەوەشی کە جێگای داخە و هەڵەیەو پێویستە ڕاست بکرێتەوە ئەوەیە، ئەوانەی زۆر گرنگی بە تەجوید و قیرائات دەدەن لەسەر حیسابی تدبر و تێگەیشتن و ئەحکامەکانی قورئان گرنگی پێ دەدەن! چونکە زانستی تەجوید و قیرائات ئەگەر هەرکەسێک ڕۆبچێت تێیدا ئیتر بەئاسانی بەئەنجام ناگات و تەمەن تەواو ئەبێت و وردەکارییەکانی ئەو زانستە تەواو نابن! بۆیە بۆچوونی فوقەها ئەوەیە کە تەنها ئەوەندەیان لە تەجوید بە واجب زانیوە کە خوێندنەوەکە ڕاست بکاتەوە وەکو حەرەکاتی پیتەکان و چەند مەسەلەیەکی تری سەرەکی، جگە لەوانە کارێکی باشەو (مستحب) ە موسوڵمان بیکات باشە و نەیکات کێشەی نییە.

نۆیەم: بەڵگەی سەرەکی ئەوانەی بەواجبیان زانیوە ئایەتی: ﴿ورتل القرآن ترتيلا﴾ و ﴿الذين آتيناهم الكتاب يتلونه حق تلاوته﴾ هەروەها فەرموودەی (كانت قراءة رسول الله ﷺ مدًّا، ثم قرا: {بسم الله الرحمن الرحيم}، يمد {بسم الله} ويمد {الرحمن}، ويمد {الرحيم} و هەروەها ئەو فەرموودەی کە ابن مسعود رضـي الله عنه وشەی (الفقراء)ی لە قورئاندا درێژ کردووەتەوە، هەموو ئەوانەش نابنە بەڵگە لەسەر ئەو هەموو وردەکارییە زۆرانەی لە زانستی قیرائات و تەجویددا هەیە کە وەکو فەرز و واجب تەماشا بکرێن.

دەیەم: شیخ الإسلام ابن تیمیة، یەکێکە لەو زانایانەی فێربوونی تەجویدی بەواجب نەزانیوە وفەرموویەتی: (ولا يجعل همته فيما حجب به أكثر الناس من العلوم عن حقائق القرآن، إما بالوسوسة في خروج حروفه، وترقيمها، وتفخيمها، وإمالتها، والنطق بالمد الطويل والقصير والمتوسط وغير ذلك؛ فإن هذا حائل للقلوب، قاطع لها عن فهم مراد الرب من كلامه، وكذلك شغل النطق بـ ﴿أأنذرتهم﴾ (البقرة:٦) وضم الميم من ﴿عليهم ولا الضالين﴾ (الفاتحة:٧) ووصلها بالواو، وكسر الهاء، أو ضمها، ونحو ذلك، وكذلك مراعاة النغم وتحسين الصوت) ابن القیم یش بە هەمان شێوە لەسەر بۆچوونی مامۆستاکەیەتی.

یازدەیەم: زانا هاوچەرخەکانیش هەمان بۆچوونیان هەیە بۆ نموونە: الشیخ عبد الرحمن السعدي دەڵێت: (إن التجويد بحسب القواعد المفصلة في كتب التجويد غير واجب). واتە تەجوید بەو شێوەی کە لە کتێبەکانی تەجویددا شیکراوەتەوە واجب نییە.

شێخ ابن باز یش فەرموویەتی: (يجوز أن يُقرأ القرآن بغير الترتيبات والاصطلاحات التي ذكرها أصحاب التجويد، إذا قُرئ باللغة العربية قراءة واضحة، لكن إذا اعتنى بما ذكره القراء وبما ذكره أصحاب التجويد، فهذا حسن من باب تحسين القراءة) پوختەی قسەکەی ئەوەیە خوێنەر دەتوانێت بەو شێوە قورئان نەخوێنێت کە زانایانی تەجوید شیانکردووەتەوە ئەوە پێویستە کە بەعەرەبییەکی ڕوون بخوینێرێت، بەڵام ئەگەر بنەماکانی تەجویدیش جێبەجی بکات ئەویش کارێکی باشە.

**الشيخ ابن عثيمين يش فەرموویەتی:** (أما التجويد فليس بواجب، التجويد تحسين للفظ فقط، وتحسين اللفظ بالقرآن لا شك أنه خير، وأنه أتم في حسن القراءة، لكن الوجوب بحيث نقول من لم يقرأ القرآن بالتجويد فهو آثم قول لا دليل عليه، بل الدليل على خلافه).

**پوختەی قسەکەی ئەوەیە تەجوید بەو وردەکاری و شیکرنەوە واجب نییە و خوێنەر گوناهبار نابێت ئەگەر بەو شێوەیە نەیخوێنێت.**

**دوازدەیەم: داوا لە فێرخوازانی زانستی قیرائاتیش دەکەم لە کوردستان کە لەم بارەوە بە تەنها قسەی زانایانی قیرائات نەخوێننەوە و بۆچوونی شەرع ناسەکانیش بزانن لە کۆن و نوێدا، بۆ نموونە: الذهبي، ابن تيمية، زۆرێکیش لە هاوچەرخەکان، چونکە فوقەها وشەرع ناسەکان لەم بارەوە دیدو بۆچوون و تێگەیشتنی پەسەند و جوانیان بۆ دەقە شەرعییەکان هەیە، هەروەها داوایان لێ دەکەم گرنگی تەنها بە حروف ی قورئان نەدەن بەڵکو زیاتر خەریکی حدود و ئەحکام و مەنهەج و عەقیدە ورِوحی قورئان بن.**

**سێزدەیەم: بە پێویستی ئەزانم لە کۆتاییدا بلێم: من لێرەدا تەنها مەبەستم ئەوەبوو بڵێم کە بە واجب تەماشا کردنی زانستی تەجوید بەو واتا دێت هەرکەسێک بەبێ وردەکارییەکانی تەجوید قورئان بخوێنێت گوناهبارە ئەوە بۆچوونێکی پەسەند نییە وفوقەهای ئیسلام لەسەر ئەو بۆچوونە نین و هیچ بەڵگەیەکی قورئان و سونەتی لەسەر نییە، ئەگینا بۆ کەسێک بتوانێت هەرچی وردەکاری تەجوید هەیە بەکاری بهێنێت کارێکی باشە و خویندنەوەکەی جوانتر دەبێت.**

من وەکو خوێشم کە ئیجازەی قیرائاتی عەشرەم وەرگرتوە نە بۆ خۆم و نە بۆ هەموو ئەوانەی کە ئیجازەیان لەلای من وەرگرتووە، ئاسانکاریم لە جێبەجێنەکردنی حوکمەکانی تەجویددا نەکردووە و بەوردی گویم لە خەتمەکانیان گرتووەو چاوپۆشیم لە هیچ هەڵەیەکیان نەکردووە، ئێستەش کە قورئان دەخوێنم هەموو وردو درشتێکی زانستی تەجوید جێبەجێ دەکەم و لە هیچ بنەمایەکی ئەو زانستە خۆم بە دوور ناگرم، بەڵام وەکو شوێنکەوتنێک بۆ زانایانی ئوممەت لە کۆن و نوێدا ئەو بنەمایانە سەرەڕای گرنگییان بەڵام بە واجبی نازانم هەموو موسوڵمانێک فێری بێت و نەلە تواناشیاندا هەیە هەموویان بەو جۆرەی کە هەیە فێری بن.

فێربوونی زانستی تەجوید بەشێوەیەکی ڕەها واجب نییە، بەڵکو ئەوەندەی واجبە کە وشەی قورئانی پیرۆزی بەڕێک و پێکی بەسەروبۆرەوە پێ بخوینرێتەوە و لەفزەکانی پێ ڕاست بکرێتەوە و بەجوانی واتاکانی بگات، چونکە زانستی تەجوید ئەحکامێکی زۆر لە خۆی دەگرێت و هەمووی لە گرنگیدا وەکو یەک نین، هەرکێیش توانای فێربوونی نەبوو بەو شێوەی کە دەتوانێت دەیخوێنێتەوە و هەوڵی خۆی چڕ بکاتەوە لە مەبەست و پەیامەکانی قورئان بەپلەی یەکەم تێبگات و دوای ئەوە چی پێ کرا لە جوانخوێندەوە باشە و پێشی نەکرا گوناهبار نابێت چونکە: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾[1] بەڵام بە شێوەیەکی گشتی فێربوونی زانستی تەجوید بەو حوکمانەشەوە کە واجب نین بۆ کەسێک بتوانێت هاوسەنگی بپارێزێت و فێریان ببێت و لەسەر حیسابی فێربوونی واتاکانی نەبێت کارێکی باشە و پەسەندە ان شاء الله، بەڵام بەبێ تکلف و زێدەڕەوی والله اعلم.

[1] - البقرة:٢٨٦.

## ئیمان پێش جوان خوێندنەوەی قورئان

عبدالرزاق له معمر له عطاء بن السائب له ابو عبدالرحمن السلمي بەڕەحمەت بن دەگێڕێتەوە کەوا دەیفەرموو: (كنّا إذا تعلّمنا عشر آياتٍ من القرآن لم نتعلّم العشر التي بعدها حتى نعرف حلالها وحرامها وأمرها ونهيها) **واتە**: کاتێک دە ئایەتمان لەبەر دەکرد، دەستمان بە لەبەر کردنی دە ئایەتی تر نەدەکرد تاکو خۆمان فێری هەرچی حەڵاڵ و حەرام و فەرمان و قەدەغەکراوی ئەو دە ئایەتە نەکردایە.

بە ڕاستی گرنگیدانی موسوڵمانان بە تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز کاتێک لەسەر حیسابی فێربوونی ئیمان و تەوحید و بابەتەکانی عەقیدەو بیروباوەر بێت دڵخۆشکەر نییە و تێکدانە بۆ ئەولەوییەتی فێربوونی زانستە شەرعییەکان، گرنگیدان بە تەجوید و فەرامۆشکردنی تەوحید وەکو ئەوەیە ماڵێک لەسەر بنچینە و بنەمایەکی لاواز و فشۆڵ دروست بکەیت کە هەر باو باران و لافاوێک ڕەنگە بیخات و بچێت گرنگی بە جوان کردنەوە و ڕازاندنەوەی دیوارەکانی بدەیت.

ئەڵبەتە هیچ کاتێک لە بایەخی تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئان کەم ناکەمەوە، بەڵام ئەڵێم: ئیمان پێش فێربوونی خوێندنەوەی قورئان و تەوحید لە پێش پێش تەجوید.

## دڵخۆشکەرە... بەڵام!

دڵخۆشکەرە کە قورئان خوێندن وقورئانخوێنان لەناوماندا زۆربوون، ئەگەر لە دیوەکەی تری وردنەبیتەوەو سادەو بە ڕواڵەت تەماشای مەسەلەکە بکەیت بە ڕاستی دلخۆشکەرە، بەڵام:

کە کەمێک شتەکان ورد ئەکەیتەوە و لەگەڵیاندا ئەوەستیت و ئەیاندەیتەر بەر تیشکی ئایەتەکانی قورئان و سوننەتە ڕوون و ئاشکراکەی پێغەمبەر ﷺ کە دەتەوێت بە پێوەری عەقیدەو و لە ڕۆشنایی بەڵگەکانی شەریعەتدا لێی بڕوانیت، خەم داتدەگرێت و دڵخۆشییەکەت وەکو دڵخۆشی کەسێکی تینووی لێ دێت، کاتێک لە دوورەوە تراویلکەیەک دەبینێ بەو هیواوە هەر دەڕوات و هەر بەهیچ ناگات !

بەڵێ نەک هەر دڵخۆشکەر دەبوو، بەڵکو دەبوو بە مایەی شانازی و شادومانییەکی زۆر گەورە بۆ موسوڵمان، ئەگەر:

١ - ئەو هەموو خۆ نمایش کردنەی لەگەڵ نەبوایە، قورئانخوێنان و فێرخوازانی تەجوید و زانستەکانی قورئانیش لەگەلیاندا، ئەوەی حیساب بێت بۆ ترس لە ڕوپامایی و کەوتنە نێو ڕیاو بەتاڵ بوونی کردەوە نایکەن!

هەر وەکو ئەوەی ئێمە فەرمانمان پێ کرابێت کردەوە چاکەکانمان بۆ هەموو خەڵکی ڕابگەیەنین وعەرزی بکەین و ڕێگە پێدرابێت جۆرەها ڕێگە و داهێنانیش لە نمایشکردنی عیبادەتەکاندا بکەین، هەر کارەساتە و هەستی پێ ناکەین مەخابن.

٢ – دڵخۆشکەر دەبوو ئەگەر خوێنەر و فێرخوازی قورئان پێش ئەوەی فێری مەخاریج و سیفەتی پیتەکان و شارەزابوون لە مەقامەکان بوایە، پیش هەموو ئەوانە – تەنانەت دوای ئەوانەش – فێری عەقیدە وشەریعەتی ناو ئەو قورئانە بوایە کە دەیخوینێتەوەو لەبەر ئەوەی تەنها و تەنها بیر لای تەجویدە دەچێت پێچەوانەکەی ئەنجام ئەدات، کەمێک فێری ئەو شەریعەتە پەک خراوەی ببوایە کە زۆرینە نە خەمی لێ دەخۆن و نە بە کێشەی خۆیانی دەزانن، بەڵکو هەمووان بە مامۆستایانی ئایینی و بە کۆڕ وکۆمەڵ و لایەنی ئیسلامی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ یەکدەنگن لەسەر ئەوەی تۆ ئەوەی لەسەرتە تەنها بیخوێنیتەوە و وەکو حاسیبە ئەجروپاداشتەکانی بژمێریت، کارکردن بە عەقیدەو بە ولاء وبراء و بە سنورە شەرعیەکان و....هتد ئەوانە کێشە نییە گرنگ ئەوەیە دەنگت خۆش بێت وخەڵکی بە خوێندنەوەکەت بگرین و لایکت زۆر بێت و یان وەکو بەهەر حاڵێک بووە هەر خەریکی خەتمە کردن بیت ئیتر با خەتمەکەت وەکو جەستەیەکی بێ گیانیش بێت وهیچ گۆڕانییەک نە لە خۆت و نە لە کەسدا درووست نەکات!

٣ – دڵخۆشکەر دەبوو ئەگەر ئەو سنوورە شەرعییانەی کە بەبەهانەی خولی فێربوونی تەجوید و قیرائات و ئیجازە وەرگرتن و بەرنامە وپێشبڕکێ نەبەزێنرایە، کە لە کاتی تەواو کردنی ئەو ئەرک و بەرنامەی کە بۆ خۆیان دایانناوە لەو کاتەدا لە هەموو کاتێکی تر زیاتر خۆیان گوناهبار دەکەن و بە زەقتر سنورەکانی نێوان ژنان و پیاوان لادەبرێت و بۆ ئاهەنگی کۆتایی خول و خەتمە و لەبەر کردنی قورئان و بەدەست هێنانی ئیجازەی قورئانی کەسانێک بانگهێشت دەکەن کە یان دینفرۆشن یان لافاوی جاهیلییەت

ڕایمالْیون و یان جگە لە جل و بەرگەکەیان هیچیان لە ئەهلی ئیسلام ناچێت! کە ئەوەش بۆ ڕێکخەرەانی ئەو جۆرە ئاهەنگە ناشەرعیانە نیشانەی ئەوەیە ئەوان جگە لە دەنگ خۆشی و لە ڕێکوپێک دەربڕینی پیتەکانی قورئان، نە لە عەقیدەو نە لە شەریعەتەکەی قورئان هیچ نازانن، هەروها نیشانەی ئەوەیە کە وا تێگەیشتوون تۆ هەر دەبێت بمێنیتەوە با بە سەرپێچی شەرعی و بە تنازلات یشەوە بێت، مانەوەش ئەو دەموچاوانەی دەوێت بۆ ئەوەی ببێتە جۆرێک لە تەزکییەی تۆ و مانەوەت، ئەگینا شەرمێکیان دەکرد و ڕازی کردنی الله یان دەخستە پێش ڕازی کردنی ئەو نموونە ناشرین و خراپانە.

٤ – دڵخۆشکەر دەبوو ئەگەر ئەو هەموو کچ و ئافرەتە موسوڵمانە بەو ئاسانییە و بەهۆی داماوی و هەژارییان لە زانستی شەرعیدا نەکرایەنە ئامانج و ئامرازێک بۆ جێبەجێکردنی زۆر بەرژەوەندی جۆراوجۆر و بەو شێوە ناشەرعی و ناشیرینە هەر ڕۆژەی بەباهانەیەکەوە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و لە ڕاگەیاندنەکاندا نمایش بکرێن و خەڵکی تەماشایان بکات، خۆ ئەو کردەوەتان پێچەاونەی ئەو قورئانەیە کە خەریکی فێربوونی و خوێندنی بوون، ئایا بیر ناکەنەوە؟!

٥ – دڵخۆشکەر دەبوو ئەگەر هاوشان لەگەڵ تەجویددا کە لە ڕاستیدا ئامرازێک زیاتر نییە بۆ تێگەیشتن لە بەرنامەی قورئان ، فێری تەوحید بوایەن کە بڕبڕەی پشتی ئیسلامە و بەبێ ڕەگ داکوتینی تەوحید لەناخی دڵی موسوڵماندا هیچ عەمەلێک وەرگیراو نابێت و بەبێ عەقیدەیەکی ڕاست و درووست و سەلامەت لە ڕووی بەرپاکردنی هەموو جۆرەکانی تەوحید و

خۆپاراستن لە هەموو جۆرەکانی شیرک و بەبێ جێبەجێکردنی بنەماکانی (الولاء و البراء) و بەبێ وردبوونەوە و تێگەیشتن لە هەموو هەڵوەشێنەرەوەیەک لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام و بەبێ تێگەیشتنی تەواو لە فەرەزییەتی جێبەجێکردنی شەریعەت و هەروەها لە واتاو و مەرجەکان و نەواقیزەکانی (لا اله الا الله)، قورئان خوێندن بەبێ ئەوانە خۆ سەرقاڵ کردنێکی خۆڕاییە و خۆ خەڵەتاندنە و لەجیاتی ئەو هەموو ئەجرەی بەنیازی تەنها بە خوێندنەوەیەکی بێ بنەما وبێ بەرجەستە کردن دەستت بکەوێت، بەپێچەوانەوە هەمووی دەبنە حوججە وبەڵگەش لەدژت، ئایەتەکانی قورئان وات پێ دەڵێن بەڵام مەخابن تۆی دەنگ خۆش کە هەموو بیرێکت لای کارتێکردنە لە گوێگر، تۆی فێرخوازی نەشارەزا بە بنەماکانی سوننەت و بیروباوەڕ وا فێرکراوی تەنها بیرت لای مەخارج و صفات واحکام بێت، وا ڕاهێنراویت و تێگەیەنراویت تەنها بیرت لەلای تەجوید بێت و زۆرێکتان بەهۆی تەجویدەوە هەر مەجالتان نەبووە بچنە سەر تەوحید ومەجالیشتان نابێت، کە ئەوە جەوهەری پەیامی پێغەمبەرانە علیهم السلام کە الله تعالی ئەوانی پێی ڕەوانە کردووە.

٦ - ساڵانە زۆربەی ئەو سەنتەر و ڕێکخراوانەی کە زۆربەی سەر بە هەندێ لایەنن و ناڕاستەوخۆ سەوادی خەڵکانێک زیاد دەکەن کە ئەوەش بۆ خۆی کارەساتێکی ترە، ساڵانە پەلەی ئەوەیانە بزانە چەند قوتابی داماوی جاهیل بە تەوحید و زانستە ئیسلامییەکان، فێری جوان خوێندنەوەی قورئان دەبن، بۆ ئەوەی لە ئاهەنگێکی قەشەنگدا و لەبەردەم کامێراکاندا وبە ئامادەبوونی کەسانێکی زۆریش کە ئەوانیش بەهەمان شێوە لاواز و

ناشارەزان لە زانستە شەرعی و خۆیانی پێ هەڵکێشن و بڵێن ئێمە ئەوەندە خەڵکمان فێری قورئان خوێندن کردووە، برۆ فێری بنەماکانی دینەکەیانی و ئەحکامی ئەو قورئانەیان بکە، فێری مەنهەجی قورئانیان بکە لە مامەڵ کردن لەگەڵ هەموو کەس و هەموو حاڵەتێکدا. جا لەبەر ئەوەی ئەو فێرخوازانە وا تێگەیشتوون، ئەوانیش ئیتر بە ڕۆتینێکی ساردوسڕ و دووبارە، باقی ژیانیان تەنها خەریکی تەجوید ئەبن بێ ئەوەی نە ئەوان و نە مامۆستاکانیشیان وێستگەیەکی ڕاستەقینەیان لەگەڵ تەوحیددا و ڕەنگدانەوەکانی لە واقیعی ژیاندا هەبێت، نەک بەنەزەری بەڵکو بە کردەیی بە شێوەیەک لە مەبەستەکانی دینەکەیان تێگەن. بۆیە فێرخوازی زانست کاتێک خەتمەیەک بە قیرائاتەوە تەواو دەکات وانازانێت هیچی هێشتبێتەوە بۆ ئیسلام بیکات، وای پێ وتراوە و لەوە زیاتریش نازانێ، وەی بە حاڵی میللەتێک بنچینەکانی دینەکەی فەرامۆش کردبێ و خەریکی ڕازاندنەوەی ڕووکەشەکان بێ و تەمەنیشی هەر لە ڕووکەشەکاندا بەسەر ببات.

٧ - دڵخۆشکەر دەبوو ئافرەتان کە کۆڵەکەی چاکبوونی کۆمەڵگان و بنەمای درووست بوونی نەوەیەکی موسوڵمانن، ئەو جەهلە زۆرەیان بە دینەکەیان نەبوایە، ئەمڕۆ ئەوان ڕێژەیەکی زۆر لە فێرخوازانی زانستی تەجوید پێکدەهێنن، لە نەشارەزایی لە مەنهەج و عەقیدەی قورئانیشدا ئاستێکی ترسناکیان تۆمار کردووە بەداخەوە، بوونە بە (امعة)! کێ بیەویت بۆ هەر ئاهەنگ و ئیش و کار و ئامانجێکی خۆی بەئاسانی بەکاریان دەهێنێت.

دەتوانم لە دوای خاڵی حەوتەمەوە درێژە بە ڕیزبەندی باسەکە تاکو حەفتا خاڵ بدەم، بەڵام (اللبيب تكفيه الإشارة) و ئەوەندە بەسە، منییش لەم جۆرە باسانەدا ئەوەندەی مەبەستم پۆزش هێنانەوەیە بۆ پەروەردگارم کە من بەریم لە جیاکردنەوەی عیبادەت لەگەڵ عەقیدەدا و دەزانم ئەوە پێچەوانەی بەرنامەی قورئان و سوننەتە، ئەوەندە مەبەستم نییە گۆڕانکاری لەناو خەڵکیدا درووست بکەم، تەنها (اقامة حجة) یان لەسەر دەکەم و هەوڵێکیشە بۆ قەبرو قیامەتی خۆم لەڕیگەی بەریبوون لە تێکدانی ئەولەویات و بنەماکانی ئیسلام کە ئێستە لەسەردەمێکداین بازاڕی گومڕاکان لەهەموو سەردەمێکی تر گەرمترەو ئەوان لە عەقیدە پاک و لە موسوڵمانە نامۆکان بەڕێزترو قسە بیستراوترن.

هاوکات ئەو خەڵکەش لە ئەنجامی کۆشش نەکردن بۆ تێگەیشتن لە دینەکەیان بوونەتە نێچیرێکی ئاسان وشوێنکەوتوویەکی چاونووقاو نەک تەنها بۆ ئەوانەی هەندێ جار بەناو ئیسلامەوە بەرەو پێچەوانەی ئیسلامیان ئەبەن، بەڵکو بوونە بە پاڵپشت و سەرخەری جۆرەها باتڵ و تەوژمی نەیار لەگەڵ ئیسلامدا، بێ ئەوەی هەست بە هیچ کێشەیەکیش بکەن، لەو لاشەوە بەتەمان بەو خۆ نماشکردنەیان بە قورئان خوێندنەوەی بەئاواز و مەقامات و بەو شەوو ڕۆژ بەدەم یەکەوەدانەیان بۆ فێربوونی هەندێ لە بابەتەکانی تەجوید و قیرائات لەسەر حیسابی بنەماکانی دینەکەیان بەنیازن بەو شێوە هەموو سەروەرییەکی دونیاو دوا ڕۆژ بەدەست بهێنن، ئەو جۆرە ئیسلام و دینداریە ڕێک و کوتوموت ئەوەیە کە ناحەزانی ئیسلام و دەسەڵاتدارانی ئەم سەردەمە کەیفیان پی دێت، جا ئێوەش هەر لە جیهانی خەیاڵدا بۆ خۆتان لافی گەورە لێبدەن. ﴿مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ﴾.

## پەیامێکی کورت بۆ خوشکانی بەڕێزم لە ڕێکخراوە ئیسلامییەکان

خوشکانی قەدرگرانم...

واجبی ئامۆژگاری دەیسەپێنێتە سەرم پێتان بڵێم: کاتێک چالاکییەک دەکەن، یان ئامادەی کۆڕ و سیمینار و موحازەرەیەک دەبن، حەڕامە وێنەکانتان بۆ خەڵکی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاو بکرێتەوە..واجبی سەرشانیشتان ئەوەیە ڕازی نەبن.

خوشکی باشم: لە جیاتی ئەوەی شەرم داتدەگرێت و سەر دادەخەیت و دەست بەسەر چاوی خۆتەوە دەگریت بۆ ئەوەی لە وێنەکەدا دەرنەکەویت، با ئەوەندە غیرەتت هەبێت و بەوانەی سەرپەرشتی ڕێکخراوەکەت دەکەن بڵێ وێنەمان مەگرن، ئێمە ئافرەتین و دەمانەوێت سەنگینی خۆمان بپارێزین، بۆچی بۆ بازاڕی بێ سەروبەری فەیسبوک و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان نمایشمان دەکەن، پێیان بڵێن بەلگەمان دەوێت لەسەر ئەوەی ئەو کارەتان شەرعییە: ﴿قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ بە ڕاستی ئەوە کارێکی بێ پاساو و ناشەرعی و حەڕامە، بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزانەش کە دەبێت شەرع بەیان بکەن و هیچ حوکمێک نەشارنەوە، کارێکی ناشیرین و ناپەسەندە، جگە لە زیان هیچ سوودیکی نە بۆ خۆتان و نە بۆ ڕێکخرواەکەتان و نە بۆ دینەکەتان نییە.

ئەمەی لێرەدا باسی دەکەم پەیوەست نییە بە تەنها یەک ڕێکخراوەوە، نەخێر، بەڵکو بەداخەوە زۆربەی ڕێکخراوە ئیسلامییەکان لە کوردستاندا ئەو کارە نابەجێیە دەکەن و دەیانەوێت بە بەزاندنی سنوورەکانی شەرع مۆدێرن و هاوچەرخیانە دەرکەون، سوێند بە الله بەوە لێتان ڕازی نابن و خەیاڵتان

خاوە بەسەد ئەوەندەش لێتان ڕازی نابن، خۆتان چاک دەزانن بەچی لێتان ڕازی دەبن:

﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ قُلْ إِنَّ هُدَى اللَّهِ هُوَ الْهُدَىٰ وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ﴾.

سوێند بە الله هەم ئەوان بە پۆست کردنی وێنەکانتان و هەم ئێوەش بەڕازی بوونتان بەو کارە تاوانبار دەبن و ئەم ئاگادار کردنەوەی منیش دەبێتە بەڵگە بەسەرتانەوە. جگە لە بەرژەوەندی ئێوەو ئەوانەی ئەو ڕێکخراوانە بەڕێوە دەبەن کە ڕێزم بۆیان هەیە و هاوکات بەزەییم بەو بیرکردنەوەیاندا دێتەوە، هیچ بەرژەوەندی و مەبەستێکم نییە.

ئەم چەند دێڕەشم لێرەدا با نیشانەو بەڵگەی بەری بوونی من بێت لەو کارە ناشەرعییەتان کاتێک دەگەڕێمەوە لای پەروەردگارم دەلێم دەسەڵاتم نەبوو ئەو ناشەرعییە وزۆر کاری ناشەرعی تریان کە دەیانکرد پێ یگۆڕم ، بەڵام ئەوەندەم پێکرا ئاگادارم کردنەوەو لێی بەریبووم!،

هاوکات با بەڵگەیەکیش بێت لەسەر ئێوەی ئافرەتی داماو کە هەرکێ هەڵدەسێت چۆن بیەوێت ئاوها بەکارتان دەهێنێت و بێ ئیرادەیی و کەم زانستیتان لە زانستەشەرعییەکاندا دەقۆزنەوە، نەوەک بڵێن نەمانزانی وکەس پێی نەوتین کە بڵاوبوونەوەی وێنەکانمان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان حەڕامە.

زۆربوونی ئەوانەی لە شەرع لادەدەن هەرگیز نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کاری ناشەرعی درووستە ئەنجام بدرێت...یا الله ئەم کوردە ئیسلاح بکەیت ڕۆژ لە رۆژ لە بەرنامەو شەرعەکەت دوور دەکەونەوەو واش دەزانن لێی نزیک دەبنەوە.

## دە بنچینەکەی زانستی قیرائات

پێویستە لەسەر هەموو کەسێک کە دەیەوێت فێری زانستێک ببێت، دە بنچینە دەربارەی ئەو زانستە بزانێت، زانستی قیرائاتیش بە هەمان شێوە وەکو زانستێکی مەزنی پەیوەندیدار بە قورئانی پیرۆزەوە پێویستە خوێندکار دە بنەمای گرنگ دەربارەی بزانێت:

**سنوورەکەی:** (القراءات القرآنية) زانستێکە بەهۆیەوە بە جوانی و درووستی وشەکانی قورئان دە خوێنرێتەوە بە پێی ئەو جیاوازییانەی دەدرێتە پاڵ گوێزەرەوەکەی لە زنجیرەی سەنەدەکەیدا، یان بریتییە لەو زانستەی کە لە ڕێگەیەوە دەتوانرێت یەکدەنگی گوێزەرەوەکانی کیتابی الله عزوجل بزانرێت سەبارەت بە جیاوازی شێوازەکانی دەربرینی وشەکان لە ڕووی گوێگرتنەوە.

باسەکانی: تایبەتە بە وشەکانی قورئانی پیرۆزەوە لە ڕووی ئەنجامدانیانەوە وەکو: مەد و قەصر و ئیدغام و ئیخفا و شتی لەو شێوە.

**بەرووبوومەکەی:** پارێزراوی لە هەڵە کردن لە قورئانی پیرۆز و شارەزابوون لە شێوازی خوێندنەوەی هەریەکێک لە گەورە پێشەوایانی خوێندنەوەی قورئان، هەروەها جیاکردنەوەی خوێندنەوەی پەسەندو ناپەسەند، لەگەڵ زۆر سوودی تردا.

فەزڵی: زانستێکی زۆر بەڕێزو مەزنی شەرعیە، چونکە پەیوەندی بە فەرموودەکانی پەروەردگارەوە هەیە.

بەراوردکردنی لە گەڵ زانستەکانی تر: بەراورد ناکرێت و لەهەموو زانستێک بەرزترە.

دانەری: پێشەوایانی قیرائات، دەشگێڕنەوە (حفص بن عمر الدوری) بووە. یەکەمین زانایش کتێبی لەو بارەوە نووسی (ابو عبید القاسم بن سلام) ە.

ناوی ئەم زانستە: (علم القراءات) کۆی (قراءة) واتە: شێوازێکی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

**سەرچاوەکەی:** لە ڕێگەی سەنەدی ڕاست و درووست و متواتر لە پێشەوایانەوە تاکو دەگاتە پێغەمبەر ﷺ .

**حوکمی شەرع دەربارەی:** واجبی کیفائیە، لە ڕووی فێربوون و فێرکردن، واتە: ئەگەر کەسانێک پێی هەڵسان لەسەر ئەوانی تر دەکەوێت، ئەگەر کەسیش پێی هەڵنەسا هەمووان گوناهبار دەبن.

**باسەکانی:** بریتین لە بنچینەکانی ئەو زانستە، بۆ نموونە: هەموو دوو هەمزەیەک لە وشەیەکدا یەک بگرن، حیجازییەکان دووەمیان تەسهیل دەکەنەوە.

❊ ❊ ❊

## زانستی قیرائات وچەند وریاکردنەوەیەکی پێویست

گومانی تێدا نییە خوێندنەوەی قورئان بەو شێوەی کە دابەزیوەتە سەر سەروەرمان ﷺ مەسەلەیەکی پێویستە و گرنگە و ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە لە توانایدا بێت کە خۆی فێری حوکمەکانی تەجوید و جوان دەرکردنی پیتەکان بکات لە جێگای تایبەتی خۆیانەوە و جەخت لەسەر دەربڕینی سیفاتی پیتەکان بکات لە کاتی قورئان خوێندندا.

لە ڕاستیدا ساڵانێک ئەم زانستە نەک لە سەر ئاستی پێشکەوتووی قیرائاتدا بەڵکو لەسەر ئاستی حوکمە سەرەتاییەکانی تەجویددا لە ناو خۆماندا بایەخی پێویستی پێ نەدراوە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا موسوڵمانان بە شێوەیەکی بەرچاو لە کوردستاندا ڕوویان لە فێربوونی ئەم زانستە کرد و گۆڕانکارییەکی باش لەو بوارەدا بەراورد بە ساڵانی ڕابوردوو درووست بوو.

بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی کۆمەڵێک بنەمای گشتی کە پێویستە لە کاتی وەرگرتنی زانستدا ڕەچاوبکرێن، بۆ نموونە مەسەلەی هاوسەنگی و پێشخستنی ئەو زانستەی کە زیاتر موسوڵمان وەکو ئەولەوییەت لەم ڕۆژگارەدا پێویستی پێیەتی، بە پێویستم زانی لێرەدا چەند خاڵێکی گرنگ بخەمە ڕوو:

١- گرنگیدانی زیاتر لە پێویست بە زانستی قیرائات و تەجوید هەمیشە لەسەر حیسابی زانستە شەرعییە پێویستەکانی تر دەبێت، چونکە زانستی قیرائات زانستێکی وردەو و باسەکانی بەربڵاون ورێگاکەی زۆر دوورودرێژە، ئەگەر بتەوێت ڕۆبچیت لەباسەکانیدا تەمەن تەواو ئەبێت وەرگرتنی ئەو زانستە بە فراوانی و بە پێی بنەماکانی خۆی تەواو نابێت، لە ڕاستیدا قیرائات بەو وردەکارییە یەکێک نییە لە پێویستییەکانی ئەم سەردەمەی خۆمان بە تایبەتی لە کوردستان کە هەوڵێکی زۆر ئەدرێت خەڵکی لە دینەکەیان دوور بخرێنەوەو لەو بارەشەوە نەیارانی ئیسلام هەنگاوی زۆریان بڕیوە، هاوکات مانەوەی ئەو زانستەش لە نێو هەندێ کەسی پسپۆڕ و بەتوانابە پێویست دەزانم بێ ئەوەی خەڵکانێکی زۆر تواناکانیان لەو بوارەدا خەرج بکەن.

٢- کێشەی موسوڵمانان لەم ڕۆژگارەدا- وەکو ئاماژەم پێکرد- کێشەی جوان خوێندنەوەی قورئان نییە بە پلەی یەکەم، بەڵکو کێشەی جوان تێگەیشتنە لە قورئان و کارپێکردنی قورئانە، ئەمڕۆ خەڵکی لە کوردستان بە زمانی حاڵ زۆرێکیان لە حوکمەکانی قورئان پشت گوێ خستووەو کاری پێناکەن، بەبەرچاویانەوە قورئان ئەسووتێت و سووکایەتی پێ ئەکرێت خۆیانی لێ حاڵی ناکەن، ئیتر تەمەن بەسەر بردن سوودی چییە لەگەڵ کۆمەڵە قیرائاتێکدا کە لە هیچ جێگەیەکی سەر ئەم زەوییەدا ناخوێنرێت جگە لە بازنەکانی وانە نەبێت، لە هەموویشی کارەساتتر بە شێوەیەکی زانستی نەبێت و هەڵەی مەنهەجی و جەوهەری گەورەی تێدا بێت لە ڕووی زانستییەوە! بۆیە پێویستە باسی ئەوەی کە موسوڵمانان خوێندنەوەیان ڕاست ئەبێتەوە بایەخی پێ بدرێت و کاتی بۆ تەرخان بکرێت و پاشماوەی

هەموو کاتەکان بۆ تێگەیشتنی تەوحیدی قورئان زیاتر لە تەجوید، حدود ی قورئان زیاتر لە حروف ی قورئان بەسەر ببرێت ، نەک زۆربەیان خەریکی تەجویدو قیرائات بن و لەولاشەوە لە گرنگترن بنچینەی دین کە عەقیدەیە بێ ئاگا بن، لە سوننەت کە هەموو وردەکارییەکانی ئیسلام و هێڵە پانەکان و بابەتە جەوهەرییەکانی ئەم دینەی لە خۆ گرتووە لە ڕووی مەنهەج و بیروباوەڕ و بەرنامەی عیبادەتەوە بێ ئاگابن، ئەمڕۆ موسوڵمانان کێێشەیان زۆر لەوە گەورەتر و ترسناکترە کە ساڵێک و دوو ساڵ وبگرە زیاتر تەنها خەریکی مەخارج و سیفات بن، یان چەند ساڵێک خەریکی فێربوونی ئیمالاتی حەمزەو ڕاوەستانەکانی بن لەسەر هەمزە دواییش هیچ سوودێکی تەتبیقی لە زەمینەی واقیعدا نەبێت و تاکو ئێستاش مامۆستایەکی قیرائاتمان تێدا هەڵنەکەوتووە موسوڵمانانی دەرەوەی کوردستان سوودی لێ ببینن! موسوڵمانان پێویستی هەنووکەییان بە جوان تێگەیشتنی بنەماکانی بیروباوەڕ هەیە لەقورئاندا و نیازیان بەڕاست ودرووست باوەڕ هێنانە بەو ئایەتانەی کە زۆربەی زۆری موسوڵمانان ڕەتیان کردووەتەوە و، بە زمانی حاڵیش- نەک گوفتار- ئەڵێن زۆرێک لەم قورئانە بە کەڵکی ئەم سەردەمەی خۆمان نایەت.

٣ - ئەمڕۆ قورئان لەناو موسوڵماناندا گەیشتووەتە ئاستێک لە نامۆیی باوەڕ ناکەم لە هیچ سەردەمێکدا تووشی ئەو نامۆییە بووبێت، موسوڵمانان نە واتای وشەکانی ئەزان و نە چەمکی ئایەتەکانی تێگەیشتوون و ڕەهەندەکانی بیروباوەڕی لێ وەرئەگرن، ئەمڕۆ قورئان لە کوردستاندا دوو جۆر هێرشی دەکرێتە سەر یەکەمیان لەلایەن بیری عەلمانییەوە دووەمیان لەلایەن بەناو زاناو بانگخوازی موسوڵمانەوە ئەنجام ئەدرێت کە ئەوان

بوونەتە تەواوکەری ئەو هێرشەو هەرجارێک بنەمایەکی لای موسوڵمانان دەشێوێنن و هەر جارێک حوکمێکی بە بەهانەیەکەوە لێ دەقرتێنن، خۆ سەرقاڵ کردن بە حوکمەکانی تەجویدەوە و بەوەش نەوەستی ساڵان لەگەڵ زانستێکی دووروودرێژی وەکو قیرائات بەسەربەری وەکو ئەوەیە ماڵەکەت گڕی گرتبێت و بە بەرچاوتەوە بسوتێ تۆیش خەریکی چاندنی گوڵ بیت لە باخچەی ناو حەوشەکەتدا و بڵێی کەس ناتوانێت لە گرنگی گوڵ و سەوزی و درەخت کەم بکاتەوە!

٤ - زانستی قیرائات لە ئاستە پێشکەوتووەکانیدا پێویستی بە چەندین زانستی ترە وەکو ئامراز و یارمەتیدەر پێش ئەوەی دەست بە فیربوونی خودی ئەو زانستە بکرێت، فێرخواز پێویستی بە شارەزاییەکی تۆکمە هەیە لە نەحو و سەرف و بەلاغە و زانستەکانی عەرەبیدا بە گشتی، بەڵام ئێستا لە کوردستاندا مەسەلەکە ئاوەژوو کراوەتەوە، کەسانێک خەریکی قیرائاتی سەبعەو عەشرەن زانیارییان لە زانستەکانی عەرەبی هەر زۆر سنووردارە و تێیاندا هەیە فاعل و مەفعول لەیەکتر ناکاتەوە  لەگەڵ ئەوەشدا چەندین قیرائەت ئەڵێتەوە وخویندکاری داماویش دەورەیان لێ داوە، ئەوەش جگە لەوەی کە باسمان کرد لەسەرەوە جۆرێکە لە تێکدان بۆ زانستیک کە لە سەردەمانی دێریندا هەموو زانایەک خۆی لە ئۆقرەی نەداوە لە بەر گرانی و دووروودرێژی بابەتەکانی، لە ڕاستیدا ئەوەی لە کوردستان ڕو دەدات لە شێواندن و تێکدانی زانستی قیرائات بە هۆی نەشارەزایی و پەلەکردنی بە دەستهێنانی ئیجازە لە هیچ شوێنێکی دونیا ڕووی نەداوە.

٥ – ئەوەی کە من لە کوردستاندا ئەیبینم ئەوەیە، زانستی قیرائات خەڵکانێکی زۆری سەرقاڵ کردووە بە جەختکردنەوە لەسەر جوان خوێندنەوەی پیتەکانی قورئان و دەرکردنی پیتەکان لە جێگەی ڕاستی خۆیانەوەو کاتێکیش دەگەنە خوێندنەوەی ئایەتیک بۆ نموونە: ﴿لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ﴾[١] لەم ئایەتەدا تەنها بیری بۆ تەحقیقی هەمزة و درێژکردنەوەی غوننە و وناسککردنەوەی ڕائی کەسەرەدار ئەو حوکمانە ئەچێت، چونکە ئەو هەر فریای ئەوە کەوتووە و قورئان کە مەنهەجێکی تێروتەسەلە بۆ ژیان لای ئەو بووەتە کتێبێکی تەجوید و قیرائات! لە جیاتی ئەوەی حوکمی وەلائ و بەرائی لێوە فێر بێت هەموو بیرێکی بۆ لای حوکمە تەجویدییەکان دەڕوات کە سەرەڕای ئەوەی بێگومان ئەو مەسەلە کەم نییە و مەسەلەیەکی گرنگیشە، بەلام ئەولەوییەت بۆ تێگەیشتنی جەوهەر و مەعنای ئایەتەکەیە و نابێت بۆ نموونە لە وشەی (یوادون) ئەوەندەی کە مەددی لازمی بیربکەوێتەوە فرێ بەسەر واتاو حوکمی ئەو خۆشەویستییەوە نەبێت کە هەندێ بەناو موسوڵمانان بۆ نەیارانی دینەکەیان هەیانە.

[١] - المجادله:٢٢

٦ – پێویستە موسوڵمان کوڕی ڕۆژی خۆی بێت و ئەوەندە ژیر بێت بزانێت دینەکەی و برا موسوڵمانەکانی لە چی قۆناغێکدان و ئەوەی پێویستە بۆیان لەو کات و سەردەمەدا چییە تاکو ئەوەیان زیاتر بۆ ڕوون بکاتەوە و بە هەموو توانەیەکی هەوڵی چارەسەر و تیمارکردنی ئەو برین و ئازارە کوشندانە بدات کە پێوەی دەناڵێنن، وەکو ئەوەی کەسێک دڵی ژان بکات و کێشەی لە دڵیدا هەبێت هاوکات پەنجەیەکیشی ژان بکات تۆ بچیت بە هەموو توانایەکەوە تیماری پەنجەی بکەیت و ڕوو لە ئازاری دڵی وەرگێڕیت.

٧ – ئەمڕۆ ئایینی ئیسلام لەم ناوچەیە و بگرە لە سەرانسەری دونیا ڕووبەڕووی لێشاوێکی نالەباری ناوخۆیی و دەرەکی بووەتەوە لە دژایەتی وناشیرین کردنی لەلایەن ناحەزانی ،ئیسلام وەکو بیروباوەڕ و مەنهەج کراوەتە ئامانج و هەڵمەتێکی گەورە لە ئارادایە بۆ دوورخستنەوەی موسوڵمانان لە دینەکەیان و پێشکەشکردنی جێگرەوەکەی لە فیکری عەلمانی و سۆشیالیستی و ناسیۆنالیزمی بۆیان، بەو پێیەش تێگەیشتنی بنەماکانی عەقیدەو گێڕانەوەی خەڵکی بۆ سەر ڕاستە شەقامی کیتاب و سونەت پێویستە ئەرکی یەکەمی هەموو موسوڵمانێکی خەمخۆر بێت وئەوە بە ئەرکی هەنووکەیی (واجب الوقت )ی خۆی بزانێت، ئەوەش پێویستی بە تێگەیشتنی قورئان هەیە وەکو مەنهەجێکی بیروباوەڕ و شەریعەتێکی گشتگیر بۆ ژیان و هەروەها تێگەیشتنی سوننەت لە ڕێگەی خوێندننەوەو لێکوڵینەوە لە کتیبەکانی فەرموودە بە گشتی و کتێبەکانی عەقیدەو کارکردن لەسەر چەسپاندنی بنەماکانی عەقیدە لە دڵی نەوەی داهاتوودا بە شێوەیەکی تایبەت چونکە وەکو دیارە هێرشێکی چڕ هەیە بۆ تێکدانی

چەمکەکانی ئیسلام لە دڵی خەڵکیدا، لەبەرانبەردا ئەگەر زۆرێک لە موسوڵمانان لە جیاتی بەرەنگاربوونەی ئەو هێرشە تەمەنیان لە تەجوید و قیرائاتدا سەرف بکەن و وابزانن هیچیان نەهێشتوەتەوە لە ڕاستیدا ئەوە داواکاری و ئاواتی ئەوانەیە کە سەرقاڵی ئەو هێرشکردنەن لە دژی ئیسلام.!

٨- هەرگیز نابێت کەس لەم وریاییەی دەیدەم وا تێبگات من خۆشحاڵ نیم موسوڵمانان گرنگی بەو زانستە بەڕێزە بدەن و تێیدا لێهاتوو بن، نەخێر ئەوەندەی پەیوەندی بە تەجویدەوە هەیە و بەلای کەم موسوڵمان بتوانێت قورئان بە ڕیوایەتی حفص بە جوانی و بەبێ هەڵە بخوینیتەوە ئەوە بە واجب ئەزانم، بۆ پسپۆڕی قیرائاتیش بە هەمان شێوە هەست بە خۆشحاڵی و شانازی ئەکەم کەسانێکی بە توانا لە ناوکورددا خەریکی بن و سەرمانی پێ بەرز بکەنەوە، بەڵگەش لەسەر ئەوە من وەکو خۆم ساڵانێک خەریکی فێربوونی ئەو زانستە بوومە و فەزڵ و چاکەی اللەم بەسەرمەوەیە بەوەی پشت و پەنام بووە بۆ پێگەیاندنی خوێندکارێکی زۆر و چەندین مامۆستاش کە ئێستە ئەوانیش خەریکی فێرکردنی خویندکارانی ئەو زانستەن، وە الله جل جلالە یارمەتیدام کە یەکەمین شەرح و لێکدانەوە لەسەر مەتنی یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی تەجوید کە بریتییە لە (متن الجزرية) دابنەم کە تاکو ئێستا سێ جار چاپ کراوە و هەزاران نوسخەی لەبەر دەستی فێرخوازاندایە، هەرچی زاراوەکانی زانستی قیرائاتیش هەیە کردوومەتە کوردی لە کتێبێکدا کە ئێستا لە کتێبخانەکاندا بەردەستە، خەمی من لەوەدایە دەبینم زۆرێک لە موسوڵمانان نازانن چی پیلانێک بۆ دینەکەیان لە ئارادایەو دەرک بەوەناکەن قەبارەی هەوڵەکان بۆ لە خشتەبردنی

موسوڵمانان چەند گەورەیە ودۆست و دوژمنی خۆیان و دینەکەیان ناناسن و لە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بارودرخەدا نین و ئەولەویتەکانیان لێ گۆڕاوە.

٩- بە قەناعەتی من وەکو قیرائاتی عەشرە چی سوغرا بێ یان کوبرا، چەند کەسانێکی کەم لە کوردستاندا تەواو لێهاتوو بن تێیدا بۆ ئەم هەلومەرجەی ئێستا بەسە، واتە قیرائاتی عەشرە بەلەبەرکردنەوە ضبط بکەن و الشاطبية و الدرة و الطيبة یان لەبەر بێت، کە من دڵنیام یەک کەسیش نییە لەو ئاستەدا بیت لە کوردستاندا، لەوەش تێپەڕێت جوان خوێندنەوەی قورئان بە پێی ڕیوایەتی حفص بەسە و موسوڵمان هەوڵەکانی چڕ بکاتەوە بۆ تێگەیتشنی پەیام وواتاو بنەماکانی قورئانی پیرۆز، هەروەها ڕێبازی ئیسلام وەکو عەقیدەو شەریعەت لە قورئان و کتێبەکانی سوننەت وەربگرێت وجگە لەوەش گرنگی زۆر بدا بە کتێبەکانی زانایانی پێشینانی سێ سەدە باشەکان وهەلەکانی تەمەن لە تێگەیشتنی گشتگیر بۆ ئیسلام خەرج بکا بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی و دەور و بەری لە سەر ئەو بنەما بە هێزانە پەروەردە بکا و هاوکات جاهیلییەتی هاوچەرخ بناسێت و خۆی و دەروبەری نزیکی خۆی لە لێشاوە توندەکانی بپارێزێت.

١٠- ئەگەر بێت و موسوڵمانان بە گشتی، یان بانگخوازان ونووسەران و پێشنوێژو وتارخوێنان لە درێژایی ژیانیاندا جگە لە ڕیوایەتی حفص هیچ خویندنەوەیەکی تر لە خوێندنەوەکانی قورئا فێر نەبن، کێشە بۆ دیندارییان لە بیروباوەڕ و شەرعدا درووست نابێت، بەڵام ئەگەر لەو پەیامە عەقیدییەی لە قورئاندا هاتووە، یان لە وردەکارییەکانی سوننەت کە لە کتێبەکانی

فەرموودەدا هاتووە، یان لە تێگەیشتن و لێکدانەوەکانی زانایانی پێشینانی چاکی ئوممەت بۆ قورئان و سوننەت بێبەش بیت، ئەگەر جەهلیان بە تەوحید و جۆرەکانی شیرک هەبێت، یان ڕەهەندەکانی نەزانینی واتاکانی ئەسمائوسیفات نەزانن، گەورەترین کێشەیان بۆدرووست ئەبێت لە دین و دونیاندا، بۆیە کاتێک خۆ خەریک کردن بە زانستی قیرائاتەوە باشە هەموو ئەو پێویستییانەت تەواو کردبێت و پێش شێوازی خوێندنەوەی ئایەتەکان واتاو تەفسیرو حوکمی بیروباوەڕ و ڕێبازی موسوڵمانێتی خۆتت لێ وەرگرتبێت.

١١ - یەکێکی تر لەو وریاییانەی پێویستە لەم بارەوە بدرێت ئەوەیە لە دێر زەمانەوە ناحەزانی ئیسلام بۆ نموونە ڕۆژهەڵاتناسەکان ئەم زانستەیان وەکو کەلێنێک تەماشا کردووە کە لەڕێگەیەوە تانە لە ڕاستێتی قورئان بدەن، بەردەوام زانایانیش بەرپەرچیان داونەتەوە، بەڵام ئەمانەی ئێستا خەریکی ئەو زانستەن لە کوردستان ئەوە نازانن توانایان زۆر لەوە کەمترە وەڵامی ئەو گومانانە بداتەوە، هەر تانەیەکیش لە قیرائات بدرێت توانای وەڵامدانەوەی نەیارانی قورئانیان نییە بەو شێوەش زیانی کارەکەیان لە سوودی زۆرتر ئەبێت بۆ ئیسلام کە ئەمڕۆ لە ململانێیەکی سەختدایە لە گەڵ ناحەزانیدا.

١٢ - سەرەڕای هەموو شتێکیش بەداخەوە ئەو زانستە بە پێی بنچینەکانی خۆی وەرناگیردرێت هەروەکو چۆن ئەمڕۆ گەندەڵی لەم وڵاتەدا باڵی ڕەشی بەسەر هەموو شتێکدا کێشاوە، مەخابن ئەم زانستەشی گرتووەتەوە و لە دیاردەکانی ئەو گەندەڵییە:

* لەلای هەندێک لە مامۆستایان ناڵێم هەموویان بووەتە جۆرێک لە پارە پەیدا کردن و هۆکارێک بۆ خۆژیاندن و خۆ پێگەیاندن لە ڕووی مادی و مەعنەوییەوە کە ئەوەشیان خۆی لە خۆ دەرخستن و ئاهەنگ گێڕان و خۆخستنەناو مەترسی ڕوپامایییەوە دەبینێتەوە، ئەگینا کەی مەعقولە لەبەر کردنی قورئان بکرێتە هۆکارێک بۆ خۆ هەڵنان و دونیا ئاگەدار بکەیتەوە کە تۆ قورئانت لەبەر کردووە.

* خوێندکارێکی زۆر ئیجازەیان وەرگرتووە لە کاتێکدا خوێندنەوەیان هەڵەی زۆری تێدایە و نازانن بە جوانی قورئان بخویننەوە و هێشتا شایستەی وەرگرتنی ئیجازە نین، ئاخر ئەم بابەتە بابەتی خاتر گرتن و ڕووگیری نییە تا مامۆستا ڕێز لە کەسێک بگرێت و رووگیری بێت و ئیجازەی پێ بدات بی ئەوەی لێهاتوویی تەواوی پەیدا کردبێت، بەداخەوە لەو جۆرە حاڵەتانە لە کوردستاندا زۆرن و لە زۆربوونیشدان.

* چەندین کەس هەیە بە پەلەپەل، یان تەنانەت بە ماوەیەکی زۆریش ئیجازەی چەندین قیرائەتی جگە لە حفص وەرگرتووە، بەڵکو ئیجازەی قیرائاتی عەشرەی بەبێ مەرجەکانی خۆی وەرگرتووە، بەڵکو ئەشیڵێتەوە بە خوێندکاران! بەڵام نازانن ئیعراب وتەوجیهی قیرائەتەکان چییە، وەجهەکانی لەیەکتر جیاناکەنەوە، لە زمانی عەرەبیدا کە بڕبڕەی پشتی ئەو زانستەیە بە شێوەیەکی گشتی کڵۆڵن، نەک سەرچاوە سەرەکییەکان بەڵکو یەک سەرچاوەیان لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی زانستی قیرائات نەخوێندوەتەوە و بیشیخوێننەوە بۆ نموونە لە کتێبێکی زانستی سەرەکی وەکو (حرز الاماني ووجه التهاني) بێ ئاگان ودیراسەیان نەکردووە چجای لەبەریان کردبێت و

لێکدانەوەکەی بزانن، ئەوە وەکو ئەوە وایە کەسێک بڕوانامەی ماستەری لە مێژووی ئیسلامی هەبێت و هیچی دەربارەی الطبري و ابن الأثير و ابن كثير نەبیستبێت،ئەمەش جۆرێکە لە لادان و بەلاڕێبردنی ئەو زانستە لە کوردستاندا، کە لەوانەیە حاڵ وا بڕوات چەند ساڵێکی تر هەزاران خاوەن ئیجازەی نا شاییستە پەیدا بن، وەکو کورد ئەڵێن: ناوێکی گەورەو شارێکی وێران.

* شێوازی وتنەوەی هەندێ ڕیوایاتی قورس وپڕ لە وردەکاری وەکو ڕیوایەتی قالون و وەرش یان قیرائەتی یەعقوب بۆ نموونە ئاسان وخۆش کراوەتەوە ! و تەنها یەک وەجهی بە خوێندکاران دەوترێت ئەو وەجهەش بەتەواوی مافی نادرێت.

* کۆمەڵێک مامۆستای ئەو زانستە لە برا عەرەبەکان لە ساڵانی ڕابووردودا لە کاتی ڕوداوەکاندا هاتنە کورستانەوە هەندێکیان -ناڵێم هەموویان- ئەم زانستەیان کردە هۆکارێک بۆ دابین کردنی کرێ خانوو و بژێوی ژیان و بەکورتی وەکو کاسبییەک مامەڵەیان لە گەڵی کرد، خوێندکارێک لە شارێک لە شارەکانی کوردستان بۆی گێڕامەوە ئەیوت یەکێک لەو مامۆستایانە لە شارێکی ترەوە ئەهات بۆ لامان ئەیوت ئێمە کۆمەڵێک بووین هەموو جارێک یەکی بیست و پێنج هەزارمان بۆی کۆ ئەکردەوە، ئەمەش ڕوونە کە ڕەهەندێکی بازرگانی وەرگرتوە.

* لە دیاردە خراپەکانی زۆر بڵاوبوونەوەی ئەو زانستە ئەوەیە کە بوو بە چاولێکەری، ئیجازە لای زۆرێک وەکو ئامانج تەماشا ئەکرێت کە ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە کە فێربوونی زانستەکە ئەبێت بکرێتە ئامانج.

* هەروەها لە دیاردە نەخوازراوەکانی هاورێ لە گەڵ زۆربوونی ئەم زانستە لە کوردستاندا ئەوەیە ئاهەنگ گێران و خۆ دەرخستن و کێبرکێ کردنی نێوان ڕێکخراوەکان و مامۆستایان و هەورەها حیزبە ئیسلامییەکانیش هاتوونەتە سەر خەت بۆ قۆستنەوەی هەلی ئەو ژمارە زۆرانەی ڕوو لە فێربوونی ئەو زانستە ئەکەن، هەموو ئەمانە لایەنی ڕواڵەتی مەسەلەکەی زاڵ کردە سەر لایەنە زانستییەکەیدا، تەنانەت وای لێ هاتووە ئێستا ڕێکخراوی واهەیە سەربە حیزبێکی دیاری کراوەو ئەو خەرجی دەکات، ڕێکخراوێکی تر سەر بە حیزبێکی ترە و کێبرکێکە زیاتر کۆمەڵە ڕەهەندێکی وەرگرتووە کە لە خراپترینیان تێکەڵ بونێتی بە سیاسەت، کە سیاسەت دیارە بە چی ئاستێکی نزم گەیشتووە لای خۆمان، جا زانستی قیرائات بخرێتە ناو ئەو زەلکاوە ئەبێت چی لێ دەر بچێت؟

* لە دیاردە خراپ و ناشەرعییەکانیش کە فێربوونی ئەو زانستە لە کوردستاندا بەدوای خۆیدا هێنای ئەوەیە ئافرەت - بێگومان مەبەستم هەندێکیانە ناڵێم هەموویان - بە ڕواڵەتێکی ناشەرعییەوە چوونە ناو ئەو زانستەوە و فێربوونیان بۆ ئەو زانستە بوو بە مایەی تێکەڵ بوونیان لە گەڵ پیاواندا و وێنە گرتن و ئاهەنگ گێڕان و خۆنمایش کردنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، کە ئەمە هەم لە ڕووی ڕووپاماییی و ڕیائەوە مەترسی هەیە و هەم لە ڕووە شەرعییەکەیەوە کە فێربوونی تەجوید و قیرائات و دەبێتە بەهانەیەک بۆ پەیوەندی ڕاستەوخۆی نێوان پیاوان و ئافرەتان بەو پاساوەوە بەردەوام وانەو موحازەرات و ئاهەنگی ئیجازە دابەش کردنی مامۆستای پیاو بۆ خوێندکاری ئافرەت بەردەوامی دەبێت و ئەوەش زۆربەی زانایان وەکو (سد الذريعة) ش بێت بە حەرامیان زانیوە، ئینجا ئەو ئاهەنگانەی کە لە

تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و لە تەلەفیزیۆنەکاندا دەبینرێت بەرهەمی ساڵێک یان زیاتر خوێندنی ئەو خوێندکارەیە لەلای ئەو مامۆستا، یەکێکیشە لەو دیاردە خراپانەی کە هەندێ لە حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان کە بە تێکەڵ کردنی چەمکەکان و سنووربەزاندنی شەرع ناسراون هێنایانە سەر زەمینەی واقیع، جاری وا هەیە کۆمەڵە ئافرەتێک پاش چەند ساڵێک قورئان لەبەر کردن ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ ساز دەکرێت کۆمەڵە بەرپرسێکی حکومی ئامادەی ئەبن کە هەر خۆیان وتوویانە ئەو قورئانە بۆ ئەو ڕۆژگارە ناگونجێت و پێویستە ڕێکی بخەینەوە! بەلای منەوە ئەوە وەکو ئەوەیە خەرمانێک کۆبکەیتەوە و لە کۆتاییدا بە دەستی خۆت بیسووتێنێت.

### لە کۆتاییدا دەڵێم:

زانستی قیرائات لە کوردستاندا بە پێی بنەماو ڕێکارو و ڕیکخستنی زانستی پێویست بەڕێوە ناچات، بەڵکو مۆرکێکی کوردی خراوەتە سەر کە جۆرێکە لە شێواندن وکوردادندن، جا بۆ ئەوەی ڕێڕەوەکەی ڕاست بکرێتەوەو بتوانێت ڕۆڵی تەندروستی خۆی ببینێت،سەرەتا پێویستە هەموو ئیجازەیەک کە تا ئێستا بەخشراوەتە فێرخوازان بخرێتە بەردەم لیژنەیەکی پسپۆڕی بەتوانا بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە لە ڕاست و درووستی سەنەدەکە بکرێت و لەوەش گرنگتر لێکۆڵینەوە لە توانا و شاییستەیی خاوەن ئیجازەو ئیجازەدەرەکەش (المجیز و المجاز) بکرێت وەکو فلتەرێک هەم بۆ دڵنیابوون لەو ئیجازەیە و هەم بۆ ئەوەی قورساییەکی زانستی پێویستی هەبێت، پێویستە کەسانێکی زانا و پسپۆڕی بێ لایەن لە دەرەوەی کوردستان بکرێنە دادوەر و داوەر لەسەر ئەهلییەتی ئەو کەسانەی کە ئەشێن بۆ وەرگرتنی ئەو

زانستە، هەروەها پیویستە کۆمەڵە مەرجێکی زانستی قورس لە ڕووناکی قسەی زانایاندا بۆ ئەم زانستە لە کوردستاندا دابنرێت بۆ ئەوەی وەکو ئەڵێن نەبیتە هەرکێ بۆ خۆی و دەرەنجام نەک تەنها زانستەکە بە جوانی فێر نەبین بەڵکو ببێتە ڕێگریش لەبەر وەرگرتنی چەندین زانستی تر کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا زۆر لەو زانستە پێویستترە.

ئەمە بۆچوون و قەناعەتی خۆمە وەکو خوێندکارێک کە خەریکی خوێندنەوەو فێربوونم لە سەرچاوەکانی زانستی قیرائات، وەکو مامۆستایەکیش کە تاکو ئێستا لە ئاستێکی سنووردارردا سەرقاڵم بە وتنەوەی بەشێک لەو زانستە، جا ئەگەر پێکابێتم ئەوە فەزڵ و چاکەی پەروەردگارمە بەسەرمەوە، ئەگەریش هەڵەم کردبێ و لەهەر بەشێکی قسەکانمدا نەمپێکابێ داوای لێخۆشبوون لە الله تعالى ئەکەم و لێی پەشیمان ئەبمەوە هەرکاتێک بۆم دەرکەویت کە هەڵە بوومە.

❊ ❊ ❊

## پیناسەیەك بۆ كتێبی (الشاطبیة)

هۆنراوەیەكە پێكهاتووە لە (١١٧٣) بەیتی شیعر، دەربارەی زانستی قیرائاتی قورئانی، ناونیشانی تەوای هۆنراوەكە بریتی یە لە: (حرز الاماني ووجه التهاني) نووسەرەكەی ناوی: (القاسم بن فيره بن خلف بن احمد ابو القاسم، ابو محمد الشاطبي الرعيني) یەكێكە لە زانایانی ئەهلی سوننەت و زانایەكی گەورەی قیرائاتی قورئانی پیرۆزە.

هۆنراوەكە بەم چەند بەیتە دەست پێ دەكات:

بدات ببسم الله في النظم اولا *** تبارک رحمانا ً رحيما ً وموئلا

وثنيت صلى الله ربي على الرضا *** محمد المهدى الى الناس مرسلا

وعترته ثم الصحابة ثم من *** تلاهم على الإحسان بالخير وبلا

وثلثت ان الحمد لله دائما *** وما ليس مبدوءا ً به اجذم العلا

وبعد فحبل الله فينا كتابه *** فجاهد به حبل العدا متحبلا

ئەم هۆنراوەیە هەموو بنەماكانی حەوت قیرائەتەكە (القراءات السبع)ی قورئانی تێدایە بە خوێندنەوەی پێشەوایان: (نافع وابن كثير وابي عمرو وابن عامر وعاصم وحمزة والكسائي).

ئەم قەسیدە جگە لەوەی كە سەرچاوەیەكی هەرە گرنگە بەڵكو گرنگترین سەرچاوەی قیرائاتە بە شێوەیەكی ڕەها، هاوكات یەكێكە لە نایابترین هۆنراوەكانی زمانی عەرەبی، بە هۆی جوانی داڕشتن و هەڵبژاردنی وشەكانی و ئاستی هونەری هۆنراوەكە بە شێوەیەكی گشتی.

(محمد بن الجزري) کە خۆی پێشەوایەکی گەورەی زانستی قیرائاتە، دەربارەی قەسیدەکەی (الشاطبي) فەرموویەتی: (ومن وقف على قصيدته علم مقدار ما آتاه الله في ذلك، خصوصاً اللامية التي عجز البلغاء من بعده عن معارضتها فإنه لا يعرف مقدارها إلا من نظم على منوالها أو قابل بينها وبين ما نظم على طريقها. ولقد رزق هذا الكتاب من الشهرة والقبول ما لا أعلمه لكتاب غيره في هذا الفن، بل أكاد أن أقول ولا في غير هذا الفن فإنني لا أحسب بلداً من بلاد الإسلام يخلو منه، بل لا أظن أن بيت طالب علم يخلو من نسخة به) واتە: هەرکێ ئەو قەسیدە ببینێت دەزانێت الله چ تایبەتمەندییەکی بەو زانا بەخشیوە، بە تایبەتی قەسیدەی حرز الأماني..کە زمانزان و کەسە بە تواناکانی ئەو بوارە دەستەوسان ڕاوەستان لەوەی بتوانن هۆنراوەیەکی لەو ئاستە بنووسن..الله عزوجل ناوبانگ و وەرگیرانێکی بۆئەم کتێبە نووسیوە کە شارەزانیم بۆ هیچ کەسێکی تر نووسرابێت لەم بوارەو، بگرە لە هیچ بوارێکی زانستی تریشدا..شارەزاش نیم وڵاتێک هەبێت لە وڵاتی موسوڵمانان ئەم کتێبەی تێدا نەبێت، بەڵکو فێرخوازێکی زانست نییە ماڵەکەی ئەو کتێبەی تێدا نەبێت.

(الشاطبية) یان (حرز الأماني ووجه التهاني) لە هەموو سەردەمەکانی دوای شاتیبی بە ئەوپەڕی گەورەیی و ڕێزەوە تەماشا کراوەو بایەخی پێدراوەو زانایان شەرحیان کردووەو گرنگی شایستەیان پێداوە.

لە بەناوبانگترین شەرحەکانی ئەو هۆنراوەیە:

١- شرح الشاطبية : شمس الدين محمد بن محمود السمرقندي لە ( ٦٠٠ ک) لە ژیاندا بووە.

٢- المهند القاضبي شرح قصيدة الشاطبي : ابي العباس احمد بن علي الأندلسي له ساڵی ( ٦٤٠ ک) وەفاتی کردووە.

٣- فتح الوصيد في شرح القصيد : علم الدين ابي الحسن علي بن محمد بن عبد الصمد السخاوي ، المتوفى سنة. ( ٦٤٣ )

٤- الدرة الفريدة في شرح القصيدة: منتجب الدين حسين بن ابي العز بن رشيد الهمداني، له ساڵی ( ٦٤٣ ) وەفای کردووە.

٥- كنز المعاني في شرح حرز الأماني ووجه التهاني: شمس الدين محمد بن احمد بن محمد الموصلي ناسراو به شعلة، له سالی ( ٦٥٦ ک) وەفاتی کردووە.

٦- الفريدة البارزية في حل القصيدة الشاطبية: ابي عبد الله المغربي محمد بن الحسن بن محمد الفاسي ، له ساڵی ( ٦٥٦ ک) وەفاتی کردووە.

٧- المفيد في شرح القصيد: علم الدين قاسم بن احمد اللورقي الأندلسي له ساڵی ( ٦٦١ ک) وەفاتی کردووە.

٨- ابراز المعاني من حرز الأماني : لأبي شامة عبد الرحمن بن اسماعيل الدمشقي ، المتوفى سنة. ( ٦٦٥ )

٩- اللآلي الفريدة في شرح القصيدة: لأبي عبد الله محمد بن الحسن بن محمد بن القاسم، المتوفى سنة. ( ٦٧٢ )

وە جلال الدين السيوطي و ملا علي القاري دوو شەرحیان لەسەری هەیە.

لە زانا هاوچەرخەکانیش کە ڕۆڵی گەورەیان هەبووە لە خزمەتی زانستی قیرائات، دوو زانای ناودار ئەو مەتنەیان شەرح کردووە:

- ارشاد المريد الى مقصود القصيد: لعلي محمد الضباع
- الوافي شرح الشاطبية: لعبد الفتاح بن عبد الغني القاضي.

بەڵام وەکو تێبینییەک بۆ فێرخوازانی زانستی قیرائات، پێم وایە سەرچاوە کۆنەکان لە شەرحی الشاطبية زۆر بە سوود نین بۆیان بەراورد بە شەرحە هاوچەرخەکان، چونکە جۆرێک لە ئاڵۆزی و گرانی تێدایە و لە شەرحەکەش دەردەچن بۆ هەندێ بواری زمانەوانی و بواری تر.

بەڵام شەرحە هاوچەخەکانی وەکو (الوافي في شرح الشاطبية) ی عبد الفتاح القاضي ڕەحمەتی خوای لێبێت باشترەو ئاسانترە، لەوانەشە کتێبی (المزهر في شرح الشاطبية والدرة في القراءات العشر المتواترة) کە کۆمەڵە مامۆستایەکی پسپۆر دایانناوە لەوەش گونجاو تر بێت، چونکە مەبەستیان بووە زۆر ئاسان و ڕووون بێت و بێگومان سوودیان لە زۆربەی سەرچاوەکاوە دێرینەکانیش بینیوە، ئەو کتێبە لە لایەن (دار عمار) لە عمان — الأردن لە ساڵی ٢٠٠١ چاپکراوە.

لەبەر ئەوەش الشاطبية بە کوردی شەرحی نییە و، وەکو خزمەتێکیش بە زانستی قیرائات، هەولێکم لەبەرنامەدا هەیە، بە گوێرەی توانای خۆم ڕوونکردنەوەیەک لەسەر ئەو کتێبە مەزنە ئەنجام بدەم و، تاکو ئێستا چەند بەشێکم بە ڤیدیۆ تۆمار کردوووە بەڵام بڵاوم نەکردووەتەوە. هەر لەسەر ئەم ڕێگەش، پێشتر- وەکو هەنگاوێکی هاو شێوە - بە دەنگ و نووسینیش شەرحێکم لەسەر مەتنی جەزەرییە ئامادە کردووەو، ئێستاش کۆمەڵە وانەیەکی دەنگیم ئامادەیە دەربارەی پێناسەی زاراوەکانی زانستی قیرائات، کە وەکو سیدی بە نیازین -ان شاء الله- هاوپێچی کتێبێکمان بکرێت دەربارەی زاراوەکانی زانستی قیرائات، کە ئێستا لە لایەن کتێبخانەیەکی ناوداری هەولێر بۆ چاپ ئامادە دەکرێت.

مەتنەکەی (الشاطبیة) چاکترین چاپەکانی بریتییە لەو چاپەی کە بە تەحقیقی علي الضباع ئەنجام دراوە، دوای ئەوەش چاپی محمد تمیم الزعبي، دواتریش چاپی د. ایمن رشدي سوید. لە ساڵی ٢٠١٤ ش (دار الغوثاني للدراسات القرآنیة) بە لێکۆڵینەوەی (المقرئ علي بن سعد الغامدي المكي) چاپێکی نایابی جوانیان کرد کە بە خەتی خۆشنووس مسعود حافظ نووسراوە.

❊ ❊ ❊

## لەبەر کردنی قورئان پێویستی بە جاڕنامە نییە

نامەیەکی کراوە بۆ ئەو خوشکە بەڕێزانەی کە قورئان لەبەر دەکەن و لە ئاهەنگێکدا خۆیان نمایش دەکەن و دەڵێن خەڵکینە ئێمە قورئانمان لەبەرە:

ئەرێ ئێوە قورئانتان لەبەر خەڵکی لەبەر کردووە یان لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگارتان؟! بۆ بە دەستی خۆتان گڕ بەردەدەنە خەرمانی ئەجرو پاداشتەکانتان، بۆ خۆتان دەکەنە هەواڵی تۆڕە کۆمەلایەتی و کەناڵەکان، بۆخۆتان دەکەنە دەستکەوتێکی گوماناوی ڕێکخراوو حیزبەکان، هاوار بۆ ئێوە چەند داماون، بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن بە کارهێنراون، دڵتان خۆشە بەوەی قورئانتان لەبەر کردووە و بەو هۆیەوە خۆتان نمایش دەکەن وخۆتانی پێوە دەنوێنن، پێشینانی ئوممەت چاکەو عیبادەتەکانیان دەشاردەوە، ئەی ئێوە شوێنکەوتووی کێن لە ئاهەنگێکی وەها ناکۆک لە گەڵ شەرعدا کاری چاکەتان بۆ هەموان ڕادەگەیەنن؟ ئەی کەواتە ئێوە مەترسی ئەوەتان لەسەر هەیە تەنها بەڕواڵەت شوێنکەوتووی قورئان بن و لە ناوەڕۆکی تێنەگەیشتبن، خۆزگە تەنها سورەتی (النساء و النور والاحزاب) و ئەو ئایەتانەی باسی بیروباوەڕ و حوکمی تایبەت بە ئافرەتانی تێدایە لەبەر بکردایە، بەڵام لە جەوهەرو ڕوحی بەباشی تێبگەشتنایە و کارتان پێ بکردایە، ئەمەی کە کردووتانە نە دایکانی ئیمانداران سەرمەشقتانە ونە کەسێکی لە دین تیگەیشتووی زانا پێشەنگتانە، جا لە منەوە وەریبگرن ئامۆژگارییەکی برایانە:

خوشکە ئازیز و داماوەکانم: لەو خۆدەرخستن و خۆعەرز کردنە بگەڕێنەوەو پاشگەز ببنەوە و فرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنن، لەبەرکردنی قورئان بۆ ئەوە نییە ئاهەنگی بۆ بگێڕن وبکرێنە هۆکارێک ڕێکخراوو

حیزبەکان خۆیانتان پێوە هەڵبنێن، کارەکەتان هەڵەیە سوێند بە الله مەبەستێکم نییە جگە لە ئامۆژگاریتان و بەرژەوەندی دین و دونیای ئێوە و هەڵسان بە واجبی بانگەواز، ئێوە بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن بوونەتە ئامراز و ژمارەیەک لەلای ئەوانەی شتەکان وەکو ژمارە وەردەگرن.

ئەزانی خوشک باشم جیاوازی ئەوەی قورئانت لەبەر بێت و لە موسحەف بیخوێنیتەوە چییە؟ تەنها ئەوەیە تۆی حافیز قورئان زیاتر دڵ و دەروونتی پێ ئاوەدان بکەیتەوەو واتاکانی قورئان و بیروباوەڕی ناو قورئان لە ناختدا ڕەگ داکوتێت ورەنگ بداتەوە ولە خۆتدا بەرجەستەی بکەیت! ئەگینا قورئان لەبەر کردن خۆی لە خۆیدا مەسەلەیەکی وا گرنگ نییە، لەو حاڵەتەدا ڕۆڵی موسحەفێک دەگێریت و چووبێتە سەر ژمارەی موسحەفەکانی تر، جا ئەگەر لە دەستپێکی لەبەرکردنیدا سەرپیچی حوکمەکانیت کرد کەواتە تۆ ستەمت لە خۆت کردووە وکارت بە ناوەڕۆکەکەی نەکردووە، ئەگینا تا ماوی قورئان لەبەر نەکەیت هیچ زیانێکی بۆت نییە و هیچ لۆمەیەکت لە دونیاو دوارۆژدا لە سەر نییە، ئەگەر ئافرەتێکی موەحید و جێبەجێکار بیت بۆ مەنهەج و ڕێبازەکەی..

لە کۆتایشدا بە خوشکانی بەڕێزم دەڵێم: ئاوڕ لە فەتوای موفتییەکان مەدەنەوەو ولە جیاتی ئەوە پرسیارێک لە دڵەکانی خۆتان بکەن کە پێم وایە ئەوان موفتییەکی ڕاستگۆن و لە ژێر کاریگەری بارودۆخدا نین، بزانە دڵەکانتان بەو خۆ ئیعلان کردن و جاڕدانە کە ئێوە قورئانتان لەبەر کردووە و لە ئاهانگێکی لەو جۆرەشدا نمایش بکرێت ئاسوودەن؟ من دڵنیام کەسانێک ئەوەندە پاک بن لە سەردەمی غەریبی ئیسلام و نەفامی موسوڵماناندا قورئان لەبەر بکە چاکەی تریشیان زۆرە و لە ناخەوە لەو کارەی کە پێیان کراوە ناڕازین..

والله اعلم بالصواب.

## ماچکردنی قورئانی پیرۆز و هەستان لەبەری

زانایان لەم بارەوە قسەی جیاوازیان هەیە بۆیە باشترە موسوڵمان هەرچی بکات لەسەر بنەمای بەڵگە بیکات ، پێشەوا (الزركشي) بەڕەحمەت بێت لە کتێبی (البرهان) دا دەڵێت: کارێکی باشە قورئان بۆنخۆش بکرێت وبخرێتە سەر جێگەیەکی بەرز، دەگێڕنەوە لە عیکریمە الله لێی ڕازی بێت کە موسحەفی خستووەتە سەر ڕوخساری و فەرموویەتی کتێبی پەروەردگارم کتێبی پەروەردگارم! بەڵام لە هیچ هاوەڵێکی تر نەهاتووە کە ئەو کارەی کردبێت، هەر بۆیە هەندێ لە زانایان وەکو پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەس ئەو کارەی بە باش نەزانیوەو زۆر زانای تریش هەر بە مەکروهیان زانیوە، لە زانا هاوچەرخەکان پرسیار لە ابن باز کرا بە ڕەحمەت بێت فەرمووی: درووستە موسحەف ماچ بکرێت و ئەو کەسەی ئەو کارە بکات هیچ گوناهێکی ناگات، بەڵام لەبەر نەبوونی بەڵگە لەو بارەوە نەکردنی باشترە، بە پێچەوانەی ئەم فەتوایەش ئەلبانی بە ڕەحمەت بێت ئەو کارەی بە بیدعە زانیوەو لەبەر نەبوونی بەڵگە ماچکردنی قورئانی پێ باش نەبووە و (ابن عثيمين) یش هەمان بۆچوونی هەیە.

لێرەدا وەکو بەهرەمەند بوون لە قسەی زانایان و لە ڕۆشنایی قسەکانیاندا ئەڵێم: ماچکردنی قورئان و دانانی لە جێگەی بەرز و بۆنخۆشکردنی و هەستان لەبەری مادام مەبەست لەو کارە خۆشویستن وڕێزگرتن بێت، ئەگەر چی بەڵگەی لەسەر نییە، بەڵام لەسەر فەتوای ئەوانەی ڕێگەیان داوە ئەڵێم: درووستە و ئاساییە بکرێت و نەشکرێت باشترە، هەر چۆنێکیش بێت دواجار پێوەری خۆشویستن و ڕێزگرتنی موسوڵمان لە قورئان ڕێزگرتنێتی لە حوکمەکانی و کار کردنێتی بەفەرمانەکانی و ڕاوەستانێتی لە سنووری قەدەغەکراوەکانی.

## حوکمی جوڵانەوەی زۆر لە کاتی قورئان خوێندندا

پرسیار: زۆر کەس لە کاتی قورئانخوێندندا خۆیان ئەجوڵێنەوە و خۆیان ئەلەرێننەوە ئەوە تا چەند درووستە؟

وەڵام: لەبەر ئەوەی جێگیر نەبووە لە پێغەمبەر ﷺ و هەروەها نەزانراوە کە یەکێک لە هاوەڵان لەکاتی خوێندنی قورئاندا سەری یان لاشەی جوڵاندبێتەوە بە شێوەیەکی بەردەوام، بۆیە ئەگەر قورئانخوێن ئەو کارە ئەگەر لەڕووی عیبادەتەوە بکات ئەوە کردارێکی بیدعەیە و جائیز نییە بیکات وەکو ئەهلی عیلم فەرموویانە، بەڵام ئەگەر تەنها ڕاهاتن بێت و مەبەستی پێی عیبادەت نەبێت ئەوە ناچێتە بواری بیدعەوە، بەڵام بێگومان نەکردنی باشترە و قورئانخوێن خۆی ڕابهێنێت لەسەر ویقار و سەنگینی لە کاتی خوێندنەوەکەیدا و واز بهێنێت لەو خووە باشترە.

ئینجا ئەم عادەتە وا دیارە پەیوەندی بە جولەکەوە هەیە، چونکە ئەوان لە کاتی خوێندنی تەورات دا بە توندی سەریان دەجوڵێنن و لاشەیان دەلەرێننەوە بەو پێیەی ئەوە بە بەشێک لە دینداری دەزانن، چونکە دەڵێن کاتێک موسی علیه السلام ئەلواحەکانی بڵاوکردووەتەوە هەرچی دارو درەخت و بەرد هەیە هاتووەتە جوڵە و لەرزین و خۆی لەراندووەتەوە.

هەروەها شێخ بکر بن عبدالله ابو زید لە کتێبی (بدع القراء) دا ئەو کارەی وەکو یەکێک لە بیدعەکان باس کردووە و هەروەها باسیشی لەوە کردووە کە ئەهلی ئەندەلوس لەو بارەوە توند بوونە و ڕێگەیان نەداوە لەکاتی قورئانخوێندندا خوێنەر خۆی بلەرێنێتەوە چونکە ئەوە لە بنچینەدا کرداری جولەکەکانە، هەروەها دەڵێت: ئەبو حەییانی ئەندەلوسی لە کتێبی

(البحر المحیط) دا باسی لەوە کردووە لە ئەندەلوس کاتێک منالآن لە مەکتەب قورئانیان دەخوێند، ئەگەر جوڵە و لەرینیان بکردایە مامۆستاکانیان لەسەر ئەو کارە لێیان ئەدان بۆ ئەوەی فێری نەبن و نەبێتە خوو بۆیان.

هەندێک لە قورئانخوێنە بەناوبانگەکانیش لە کاتی قورئانخوێندندا بە لای ڕاست و چەپدا خۆیان ئەلەرێننەوە یان سەریان پاش و پێش پێ دەکەن ئەوەش ڕەنگە کاریگەری لەسەر خەڵکی عەوام هەبێت وبکرێتە بەڵگە! زیاتریش ئەم حاڵەتە لە لای قورئانخوێنەکانی میسر هەیە چونکە سەرجوڵاندن لە کاتی قورئان خوێندندا لە دێر زەمانەوە لەوێ بووونی هەبووە. زۆر جاریش مەسەلەکە لە کاریگەر بوون و کاردانەوەی خوێنەر سەرچاوە دەگرێت لەگەڵ ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا، بەڵام مەسەلەکە دواجار ڕاهاتنە و مادام خیلافی سوننەت بێت نەکردنی باشترە با بەمەبەستی دینداریش نەبێت، چونکە قورئانخوێندن وەکو ئاشکرایە خۆی بۆ خۆی عیبادەتە. بە کورتی ئەگەر سەرو لاشە جوڵاندنی خوێنەری قورئان وەکو عیبادەت ئەنجام بدرێت ئەوە بیدعەیەو نادرووستە، بەڵام ئەگەر بوویێتە خوویەک و مەسەلەکە راهاتن بێت ئەوە نابێتە بیدعە، بەڵام وازلێهێنانی باشترە و الله اعلم.

❊ ❊ ❊

## زۆر خوێندنەوەی قورئان بە تەنها گرنگ نییە، تێگەیشتنی گرنگترە!

﴿قل هو الله احد﴾ سەرەڕای ئەوەی کە پیتەکانی زۆر کەمن، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو سورەتە کورتە، هاوتایە بە سێ یەکی هەموو قورئان، چونکە ناوەڕۆک و باسەکەی پەیوەندی بە تەوحیدەوە هەیە، بەوەش دەزانرێت کە باس و ئایەتەکانی تەوحید، لە هەموو باس وبابەتێکی تر گرنگترن لە ئیسلامدا...[1].

موسوڵمان لەم سەردەمەدا زۆرترین سورەتی قورئان کە بیخوێنێت سورەتی (الإخلاص)، بەڵام لەبەر ئەوەی خوێندنەکە تێگەیشتن و تێڕامانی نوقسانە، بۆیە کێشەی یەکەمی موسوڵمانان لەم سەردەمەدا لەبواری تەوحیددایە، قورئان سەرچاوەی ئیمان وهیدایەت و تەوحیدە، بەڵام خوێندنەوەی بێ تێگەیشتن و بازدان بەسەر ئایەتەکاندا بەبێ تێرامان و پەی بردن بە واتا و وانەکانی، کێشە و گرفتی هەرە گەورەی سوود وەرنەگرتنە لە قورئان: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾[2] .

❊ ❊ ❊

---

[1] - الفتاوى ١٧/١٩٠.

[2] - محمد:٢٤.

## حوكمی قورئان خوێندن بە ڕاكشانەوە

پرسیار: ئایا گوناهبار نابم بەڕاكشانەوە قوران بخوێنم؟ نابێتە كەم ڕێزی بەرانبەر قورئان؟

وەڵام: دروستە قورئان بە دانیشتن و بە ڕاكشانەوە بخوێنرێتەوە، گەر پێویستییەک هەبێت بۆ ئەو شێوازە لە خوێندنەوە یان نەبێت، الله تعالی فەرموویەتی: ﴿الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَى جُنُوبِهِمْ﴾[1].

بێگومان قورئان خوێندیش داخلی ئەو ئایەتەیە و یادكردنی الله یە.

دایكمان عائیشە ڕەزای پەروەردگاری لێبێت فەرموویەتی پێغەمبەر ﷺ شانیداداوە بە باوەشییەوە قورئانی خوێندووە: (كان النبي ﷺ يَتَّكِئُ فِي حَجْرِي وَأَنَا حَائِضٌ ثُمَّ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ)[2] ئەوەش وەكو ابن رجب فەرموویەتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لە كاتی شانداران و ڕاكشان و پاڵكەوتن ئاساییە و دروستە قورئان بخوێنیت.[3]. ئەوە وەكو ئەوەی كارەكە درووستە و بەڵگەی لەسەر هاتووە، بەڵام موسوڵمان تا بتوانێت زیاتر بەڕێزو تەقدیرەوە بەرانبەر قورئان دانیشێت باشترە و تەنانەت زانایان لە ئادابی قورئانخوێندا باسی ئەوەیان كردووە كە خوێنەر باشترەو جوانترە كە: بەدەست نوێژەوە قورئان بخوێنێت و جلو بەرگ و شوێنەكەی پاک و خاوێن بێ. سیواک بەكارهێنان پێش قورئان خوێندنەكە و ئەگەر سیر و پیازی خواردبێت قورئان نەخوێنێت تاكو ئەو بۆنە دەروات و ڕووی لە قیبلە بێت و بە ویقار و ڕێزەوە دانیشتبێت و دەنگی خۆی خۆش بكاتەوە. والله اعلم

---

[1] - آل عمران/١٩١

[2] - رواه البخاري(٢٩٧) ، ومسلم..(٣٠١)

[3] - "فتح الباري" (٤٠٦/١)

## حوکمی خەتم کردنی قورئان بە کۆمەڵ

سڵاو مامۆستا، ئایا خەتمی بەکۆمەڵ هەمان خێری خەتمی تاکەکەسی هەیە و درووستە؟

خەتمەی قورئان بریتییە لەوەی خوێنەر لە سەرەتای سورەتی (الفاتحة) تاکو کۆتایی سورەتی الناس بخوێنێتەوە بەمەرجەکانی خۆی، ئەوە پاداشت و ئەجری خەتمەیەکی تەواوی بۆ ئەنووسرێت ئەگەر خوێنەرەکە موەحید بێت باوەڕی بەهەموو ئەوەی لە قورئاندا هاتووە هەبێت وەکو ئەحکامەکانی بیروباوەڕ و حەڵاڵ و حەرامەکان وسزا شەرعییەکان و هەواڵی غەیب و.... ئەوەی لە توانایدا هەبێت کاری پێ بکات.

خەتمەیەکی تر هەیە هەندێک لە زانایان ئاماژەیان پێ کردووە کە خەتمەی گوێگرتنە، ئەویش بریتییە لەوەی کەسێک گوێ لە هەموو قورئان بگرێت بە دەنگی کەسێکی تر، چی لە ئامێرێکەوە بێت یان لە کەسێکەوە لەبازنەیەکی زانستیدا بۆی بخوێنێتەوە، بێگومان ئەمەش هەر خێرو پاداشتی خۆی هەیە، بەڵام ناگاتە پاداشتی ئەو کەسەی کە خۆی خەتمی قورئان دەکات و هەموو ئایەتەکانی دەخوێنێتەوە.

سەبارەت بەوەی کەسانێک پێکەوە کۆ ببنەوە و پێکەوە خەتمەیەک بکەن، بۆ نموونە یەکی لاپەڕەیەک یان حیزبێک یان جوزئێک بخوێنن تا قورئان بەو شێوە و بە دابەشکردنی ئایەتەکان لە نێوان خۆیاندا دەخوێننەوە و خەتم دەکەن، بێگومان ئەم جۆرە خەتمە نابێتە ئەو خەتمەی کە خۆت هەموویت خوێندوەتەوە، چونکە تۆ لێرە زیاتر گوێگر بوویتە و کەمتر خوێنەر بوویتە، پاداشتی خوێندن و گوێگرتنیش هاوشێوە نین، بۆیە

کە بەو شێوە خەتمەیەک تەواو بکرێت لە بازنەیەکدا بێت پێکەوە دابنیشن، یان لەڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بێت، هەر کەسێک لەوانەی بەشدار بوونە لەو خەتمەیە ناتوانن بڵێن خەتمی قورئانمان کردووە، بەڵکو ئەوەندەی خوێندووە کە بە فیعلی خوێندوویەتی.

بەڵام کارەکە خۆی لە خۆیدا کارێکی باشە و ئەچێتە بازنەی زیکرو یادی الله کە لە فەرموودەی صحیح دا هاتووە، هەروەها زۆربوونی کۆڕی قورئان خوێندن و فێرکردنی تەجوید و شەرح و لەبەر کردنی فەرموودەو زانستی شەرعی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا کارێکی باشە و لە مەودای نزیک و دووردا شوێنەواری باشی دەبێت.

لە فەرموودەشدا لە سەحیحی موسلیم هاتووە: (ما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله- يدرسونه-ويتدارسونه بينهم إلا نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفتهم الملائكة، وذكرهم الله فيمن عنده).والله اعلم.

❊ ❊ ❊

## قورئان خوێندن بە دەنگی بەرز لە پێش وتاری هەینیدا

قورئان خوێندنی کەسێک لە سەماعەی مزگەوتەوە پێش وتارو نوێژی هەینی، یان لە ڕێگەی ئامێرێکەوە، کارێکی داهێنراوە و بیدعەیەکە هیچ بنەمایەکی لە دینی ئیسلامدا نییە وکارێکی بێ بەڵگەیە، هاوەڵان لە مزگەوتدا خەریکی نوێژ دەبوون تاکو پێغەمبەر ﷺ، یان خەلیفەکان دەچوونە سەر مینبەر بۆ خوێندنەوەی وتار. پێشەوا مالک لە کتێبی (الموطا)دا دەگێڕێتەوە لە سەردەمی عومەردا ڕەزای الله ی لێبێت، موسوڵمانان ڕۆژی هەینی لە مزگەوت خەریکی نوێژکردن دەبوون تاکو عومەر الله لێی ڕازی بێت سەردەکەوتە سەر مینبەر، دوای ئەوە ئیتر نوێژیان نەدەکرد و گوێبیستی وتارەکەی دەبوون.

هەروەها لە صحیح ی موسلیم دا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من اغتسل ثم أتى الجمعة فصلى ما قدر له ثم أنصت حتى يفرغ من خطبته ثم يصلي معه غفر له ما بينه وبين الجمعة الأخرى وفضل ثلاثة أيام)

واتە: هەرکێ ڕۆژی هەینی غوسلی جومعە بکات وبچێتە مزگەوت و ئەوەندەی بۆی نووسرابێت و بتوانێت نوێژ بکات وئینجا گوێبیستی وتارەکە ببێت تاکو وتارخوێن لێ ئەبێتەوە ونوێژەکەی بە جەماعەت ئەنجام بدات گوناهی نێوان هەردوو جومعەکەی بۆ دەسڕێتەوەو چاکەی سێ ڕۆژي تریشی بۆ دەنووسرێت.ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوننەتە تاکو پێش دەست پێکردنی خوتبەکە موسوڵمانان نوێژ بکەن نەک کەسێک بە دەنگی بەرز قورئان بخوێنێت و لەوانیشی تێک بدات.

بۆیە درووست نییە ڕۆژی جومعە دەنگ بە قورئان خوێندن بەرز بکرێتەوە، چی لەڕێگەی کەسێکەوە بێت یان لە ڕێگەی ئامێرێکی تۆمارکردنی دەنگەوە بێت و هەموو ئەوانە لەگەڵ ئەوەی کە بیدعەیە بە زیان و تەشویش کردنیش دەگەڕێتەوە بۆ سەر موسوڵمانانی ناو مزگەوت و دەرەوەی مزگەوتەکەش، لە موسنەدی ئەحمەد یشدا فەرموودەیەک هاتووە ابن عبدالبر بە صحیح ی زانیوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لا يجهر بعضكم على بعض بالقرآن) واتە: دەنگتان بە قورئان خوێندن لەسەر یەکتر بەرز مەکەنەوە.

پرسیار لە لیژنەی گەورە زانایانی سعودیە لەو بارەوە کراوەوفەتوایان بەڕاشکاوی ئەوە بووە کە ئەو کارە بیدعەیەو نا درووستە.

هەروەها پرسیار لە موفتی گشتیش کراوە لەوبارەوەو لە وەڵامدا فەرموویەتی: (لا نعلم لذلك أصلا لا من الكتاب ولا من السنة ولا من عمل الصحابة ولا السلف الصالح رضي الله عن الجميع، ويعتبر ذلك حسب الطريقة المذكورة من الأمور المحدثة التي ينبغي تركها؛ لأنه أمر محدث، ولأنه قد يشغل المصلين والقراء عن صلاتهم وقراءتهم).

بە کورتی قورئان خوێندن لە پێش خوتبەی جومعە، چی لەڕێگەی قورئان خوێنێکەوە بێت، یان لەڕێگەی ئامێرێکی موسەجەل و مۆبایلەوە بێت، دروست نییە و بیدعەیە، بیدعەش هەرگیز لە زیان زیاتر خێرو پاداشتی تێدا نییە با بەڕوالەتیش کارێکی باش بێت، چونکە ئەگەر باش بوایە بۆ دینداری لەو جێگەدا بێگومان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵان ئەنجامیان ئەدا.

هەرچی ئەوانەش کە وتوویانە ئەو کارە جائیزە، بەڵگەیان ئەوەیە قورئان خوێندن کارێکی باشە موسوڵمانی لەسەر کۆ بکرێتەوەو، مادام فەرمانێک نەهاتووە بڵێت پێش خوتبەی جومعە درووست نییە قورئان بخوێنرێت ئیتر کەواتە ئەوە کارێکی درووستە، ئەوەش قسەیەکە لە مونتەهای لاوازیدایە و بەوەش بێت دەکرێت سەدان بیدعە بخرێتە ناو عیبادەتی موسوڵمانانەوە.

❊ ❊ ❊

## حوكمی قورئان خوێندنی ئافرەت لە كاتی سوڕی مانگانەدا

پرسیار: مامۆستا ئایا ئافرەت لە كاتی سوڕی مانگانەو زەیستانیدا درووستە لە مۆبایلەوە قورئان بخوێنێت؟

وەڵام: سەرەتا خیلافێک لەسەر ئەم مەسەلە لە نێوان زانایاندا هەیە، چونكە هەندێكیان بەراوردی ئەو دوو حاڵەتەیان بەلەشگرانی (جنابة) كردووەو وتوویانە درووست نییە بۆیان قورئان بخوێنن.

بەڵام بە پێی هەندێک لەو زانایانەی لێكۆڵینەوەیان كردووە قەولی پەسەند ئەوەیە كە ئافرەت لە كاتی سوڕی مانگانەو وزەیستانیدا بۆی هەیە لەبەر قورئان بخوێنێت و لە موسحەفیش هەر دەتوانێت بەڵام بە مەرجێک دەستی پێوە نەدات وبە شتێک لاپەڕەكانی هەڵداتەوە، ئەم ڕێگەپێدانەش لەبەر چەند بەڵگەیەكە، لەوانە:

١ – ئەوانەی كە وتوویانە ئافرەتی بێ نوێژ و زەیستانی نابێت قورئان بخوێنن، پشتیان بە فەرموودەیەكی لاواز بەستووە كە بریتییە لە: (لا تقرأ الحائض ولا الجنب شيئًا من القرآن) واتە: ئەو ئافرەتەی لە حەیزدایەو ئەو پیاوەش كە تووشی لەش گرانی بووە بۆیان نییە قورئان بخوێنن، بەڵام ئەم فەرموودە لاوازە و كەسێک لەسەنەدەكەیدا هەیە بەناوی اسماعیل بن عیاش، ابن تیمیة دەربارەی ئەو فەرموودە فەرموویەتی: (وهو حديث ضعيف باتفاق أهل المعرفة بالحديث). (٢١/٤٦٠). واتە ئەوە فەرموودەیەكی لاوازە كۆكبوونی شارەزایانی فەرموودە.

٢- بێگومان لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەت تووشی سوڕی مانگانە دەبوون و ئەو حاڵەتەی بۆ نوێژیان بەسەردا دەهات، بەڵام هیچ دەقێک نییە قورئان خوێندنی لێیان قەدەغە کردبێت.

٣ - ئەوان بەراوردی ئەو دوو حالەتەیان لەگەڵ لەش گرانیدا کردووەو ئەوەش وەکو زانایان فەرموویانە هەڵەیە، چونکە سوڕی مانگانە و زەیستانی ماوەیەکی زۆری پێدەچێت وزۆر دووبارە دەبێتەوە و ئەگەر ئەوان لەو ماوە زۆرەدا قورئان نەخوێنن لەبیریان دەچێت و خیری زۆریان لەدەست دەردەچێت، بە پێچەوانەی لەش گرانی کە بەکاتێکی زۆر کەم لادەبرێت.

٤- کاتێک دایکمان عائیشة رضـي الله عنها تووشی سوڕی مانگانە بوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: (افعلي ما يفعله الحاج غير ان لا تطوفي بالبيت)، واتەهەموو ئەو کارو ئەرکانەی حاجییەکان دەیکەن تۆیش بیکە جگە لە تەواف نەبێت مەیکە، چونکە تەواف هاوشێوەی نوێژە نوێژیش لەسەریان حەرامە لەماوەی حەیزو نیفاسدا، تەنها باسی تەوافی کرد وباسی ئەوەی نەکرد کە بۆی نییە قورئان بخوێنێت.

٥ - هەموو ماڵێک لەو حاڵەتانەیان تێدایە و ئەگەر قورئان خوێندن حەرام بوایە لەسەریان دەبوو دەقێکی ڕوون و بڕاوە لەو بارەوە هەبوایە، وەکو چۆن بەڵگە دەربارەی کەسی لەشگران هەیە کە قورئان خوێندنی لەسەر قەدەغە کراوە.

٦ - الله تعالى فەرمانی بە خوێندنەوەی قورئان کردووە و بەڵێنی پاداشتی بە خوێنەرەکەی داوە، ئەسڵیش لەم مەسەلە ڕێگە پێدانە تاکو بەڵگەیەک بە پێچەوانەوە هەبێت، هیچ بەڵگەیەکیش نییە پشتی پێ ببەسترێت و قورئان خوێندن لەسەر ئەو دوو جۆرە ئافرەتە حەرام بکات.

بۆیە پوختەی وەڵامەکە ئەوەیە: سەرەڕای ئەوەی کە خیلافێک لەسەر ئەم مەسەلە لە نێوان زانایاندا هەیە، بەڵام بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کە درووستەو هیچ کێشەیەکی شەرعی تێدا نییە ئەو ئافرەتانەی لە سوڕی مانگانە و زەیستانیدان قورئان لە ڕێگەی مۆبایل و ئامێرەکانی ترەوە بخوێننەوە، هەروەها لە موسحەفیشەوە دەتوانن بیخوێنن بەو مەرجەی دەستی پێوە نەدەن و بە شتێک لاپەڕەکانی هەڵدەنەوە، یان وەکو هەندێ لە زانا هاوچەرخەکان فەرموویانە لە کاتی هەڵدانەوەی پەڕەکانی دەستکێش لە دەست بکەن، بێگومان کە قورئان خوێندنیش درووست بێت بۆیان بە هەمان شێوە ئاساییە وهیچ کێشەیەکی نییە کە کتێبی زانستە شەرعییەکان و تەفسیر و وێردەکانیش بخوێنێتەوە... والله اعلم.

❊ ❊ ❊

## چەند کورتە باسێك دەربارەی ئیجازەی قورئانی

پێناسەی ئیجازەی قورئانی لە ڕووی زمانەوانییەوە: لە زمانی عەرەبیدا دەوترێت: (جاز الطريق) واتە: ڕێگاکەی بڕی، یان دەوترێت (اجاز رايه) واتە: بۆچوونەکەی خۆی تێپەڕاند، هەروەها بە واتای خەڵات دێت، دەوترێت: (أجاز يُجيزُه، إذا أعطاهُ). وەکو لە فەرمودەکەی بوخاریدا هاتووە: «أَجيزوا الوفد بنحو ما كنتُ أُجيزُهم به »[1].

ئیجازە وەکو زاراوە بریتییە لە: (إذن في الرواية لفظًا أو خطًا) مۆڵەتیکە بۆ قورئانخوێندن بەڕیوایەت لە ڕێگەی دەربڕین یان نووسین. یان: (شهادة من الشيخ المجيز للطالب المجاز ببلوغ مرتبة معينة في العلم.مثل: الحفظ، الإتقان في الأداء، الأهلية للإقراء).واتە: واتە شایەتییە یان بڕوانامەیەکە مامۆستای شارەزا لە قورئانخوێندن دەیداتە قوتابیەکەی کە ئەو گەیشتووەتە پلەوپایەیەکی دیاریکراو لە زانستی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا، وەکو: لەبەرکردن و کارامەیی و لێهاتوویی لە خوێندنەوەیدا هەروەها تواناو ئامادەیی بۆ گەیاندنی ئەو زانستە بە فێرخوازانی زانست.[2] لەم پێناسەوە دەتوانین بزانین کێ شایستەی ئیجازەیە و شایستەی نییە.

❊ ❊ ❊

[1] - بڕوانە: تهذيب اللغة لأبي منصور الأزهري، وتاج العروس للزبيدي.

[2] - بڕوانە: الإجازات القرآنية/ محمد بن فهد البشر.

## ئایا هەبوونی ئیجازە مەرجە بۆ فێرکردنی قورئان؟

ئایا مەرجە مامۆستای فێرکردنی قورئان مۆڵەتی بەسەنەد وەرگرتبێت لە مامۆستایەکی لە خۆی شارەزاتر ، یان ئەگەر لێهاتوویی تێدا بوو و لە ڕووی تیۆری و کردەییەوە ئەتوانێ هەڵسێت بەوکارە؟ زانایان لە دێرزەمانەوە فەرموویانە: (لا تاخذ القرآن من مصحفي، ولا العلم من صحفي) واتە ئەو کەسەی خەڵکی فێری قورئانخوێندن دەکات پێویستە لە مامۆستایەکی کارامەی وەرگرتبێت نەک خۆی خۆی فێر کردبێت چونکە قورئان وردەکاری زۆری تیدایە و زۆربەشی پێویستە لە زاری مامۆستاوە بە دەربڕین فێری ببێت ، بەڵام ئەمە بەو واتایە نییە ئەگەر کەسەکە ئیجازەی نەبوو ناتوانێت بەو کارە هەڵسێت، دەکرێت کەسێک بە جوانی فێری قورئان بووبێت و ئیجازەی نەبێت و خەڵکی فێر بکات، لەم بارەوە زانای بەناوبانگ جلال الدين السيوطي لە کتێبی (الإتقان في علوم القرآن) دا بە توندی وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە وادەزانن مامۆستای قورئان پێویستە ئیجازەی هەبێت، خۆ ئەگەر ئیجازەی بە شاییستەیی وەرگرتبێت ئەوە باشترە چونکە ئیجازە واتای ئەوە دەگەیەنێت کەسێکی شارەزا مۆڵەتی قوتابییەکی داوە بۆ فێرکردنی قورئان بە هۆی هەبوونی مەرجەکانی مامۆستایەتی قورئان.

❊ ❊ ❊

## ئایا پێغەمبەر ﷺ ئیجازەی بەکەس داوە؟

لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ شتێک نەبوو بە ناوی ئیجازەی قورئانی، وا دەردەکەوێت ئەم باسە لە گەڵ سەرەتای نووسینی کتێبدا لەسەردەمی (التدوین) لە سەدەیەی سێیەمی کۆچی بۆ یەکەم جار پەیدا بوو بێت ، لە بنچینەشدا ئیجازە بۆ فەرمووده بوو دواتر لە بواری قورئان خوێندندا پەیدا بوو. کەواتە پێغەمبەر ﷺ ئیجازەی لە جیبریل (علیه السلام) وەرنە گرتووەو هاوەڵانیش کەسیان ئیجازەیان لە پێغەمبەر ﷺ وەرنەگرتووە، بەڵام ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێ ئەم کارە هیچ بنەمایەکی نەبێت، بۆیە زانایان لەم بارەوە هەندێ بەڵگە دەهێننەوە وەکو: تەزکیە کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ خوێندنەوەی هەندێ لە هاوەڵان و لێ وردبوونەوەی هاوەڵان لە بواری جوان خوێندنەوەی قورئان لە گەڵ تابعییەکاندا فەرموویانە ئەوە لە ئیجازە پێدان گرنگترە، بەڵام بە گشتی وشەی ئیجازە لە قورئاندا لەسەدەی سێیەمی کۆچی پەیدا بوو لەگەڵ سەرەتای کتێب دانان لە زانستی قیرائاتدا لەو سەردەمەشدا مەرجی بەراورد لە گەڵ ئەم سەردەمەی خۆمان زۆر قورس بوە چونکە قوتابی ئیجازەی وەرگرت واتە دەبێتە مامۆستا.

❊ ❊ ❊

## مەرجەکانی ئیجازە وەرگرتن لە قورئاندا

لەبەر ئەوەی سەرپێچیەکی زۆر هەیە لە بواری رەچاونەکردنی هەبوونی مەرجەکانی ئیجازەوەرگرتن لە بواری خویندنەوەی قورئانی پیرۆز و حاڵ گەیشتووەتە ئەوەی زۆر مۆڵەتپیدراو دەبینی حوکمە سەرەتاییەکانی تەجوید نازانێت بە باشم زانی باسی ئەو مەرجانە بکەم کە پێویستە لە فێرخوازدا هەبێت پێش ئەوەی دەستکاتە خوێندنی خەتمەیەک بۆ ئەو مەبەستە، لە ڕاستیدا ئەو کەسەی دەیەوێت ئیجازەو سەنەد وەربگرێت لە خوێندنەوەی قورئاندا بە پێی قسەی زانایان پێویستە چەند مەرجێکی تێدا هەبێت لەوانە دوو مەرجی سەرەکیە کە پێویستە هەیبێت:

١- العدالة: ئەو کەسەی دەیەویت ئیجازەی قورئان وەربگرێت پێویستە عەدالەتی تێدا جیبەجێ بووبێت، واتە: فاسق نەبێت، تاوانی ئاشکرای نەبێت پێی بناسرێت ، ئەهلی بیدعە نەبێت و عەقیدەی ڕاست و دروست بێت ، بۆ ئەوەی نەبێتە هەڵگرێکی خراپ و ناشاییستە بۆ قورئانی پیرۆز ، ئینجا ئیجازە شایەتیدانە بۆ ئەو کەسەی خەتمەیەکی قورئانی تەواو کردووە کە ئەهلە و شایانی ئەوەیە ، ئەگەر وانەبێت، لێپرسینەوەی تێدا دەبێت لەلای الله عزوجل بۆ مۆڵەتدەرو مۆڵەت پێدراو پێکەوە .بۆیە ئەگەر مۆڵەتپێدراوەکە تاوانی بە ئاشکرا دەکرد یان درۆی دەکرد ئەوە شایەتیەکی ناحەقی بۆ دراوە .

٢- الضَّبْطُ: واتە لێهاتوویی و کارامەیی و شارەزایی تەواو لە خوێندنەوەی قورئان بە پێی بنەماکانی تەجوید، ئەمەش دەبێتە دوو بەشەوە:

**یەکەم:** ضبط العلم والفهم: پێویستە قوتابی بە باشی لە مامۆستاکەی تێبگات، ئەو ڕیوایەتەی کە لای خوێندوویەتی بە جوانی وەریگرتبێت لە ڕووی (اصول و فرش) بنەما نەگۆڕ و گۆڕاوەکان، هەرچی وردەکاری خوێندنەوەی ئەو ڕیوایەتە هەیە فێری بوو بێت.پێویستە وەجههەکان شێوازەکانی ئەو ڕیوایەتە، جێگاکانی راوەستان و دەست پێکردن بە گشتی ئەوەی تایبەتە بەو ڕیواتەوە بە تایبەت، ئەم جۆرە (ضبط)ە بە هیچ شێوەیەک نابێت ئاسانکاری و کەمتەرخەمی تێدا بکرێت لە لایەن مامۆستا و، هەرگیز بە تەنها کوێگرتن لە مامۆستا بە دەست نایەت بەڵکو پێویستە سەرچاوەی قیرائات بخوێنیتەوە و لە ڕووی تیۆریەوە خۆی پڕ زانیاری بکات دەربارەی ئەوەی کە خەریکی خوێندنێتی .

**دووەم:** ضبطُ الحفظِ والاستظهارِ والأداء:

واتە: پاش تێگەیشتنی باش و لەبەرکردنی قورئان – هیچ نەبێت چەند جوزئێک– و فێرخواز بتوانێت بە جوانترین شێوە ڕەچاوی حوکمەکان بکات و وردەکاری پایەکانی مەد و غوننەکان و دەربڕینی ڕاست و ئەو پیتە بەرزو نزمانەی دەکەونە تەنیشتی یەکتر و وشە تایبەتەکان کە ڕاست خوێندنەوەیان پێویستی بە لێهاتووی هەیە و ئەو حاڵەتانەی بە زیاتر لە شیوازێک دەخوێنرێنەوەو و زۆر شتی تر کە ئێستا ناکرێت شی بکەینەوە ..

بەڵام بە داخەوە ئەوەی من دەیبینم لەم ڕۆژگارەدا، لە کوردستان قوتابی خاوەن مۆڵەت نەک هەر ئەو لایەنەی لاوازە بەلکو جاری وا هەیە هەر نیەتی، ئەدائیشی هەڵەیە و گوێگری شارەزا سەرسام دەبێت لەسەر چی بنەمایەک ئیجازەی پیدراوە، بۆیە پێویستە مامۆستا قوتابی وەرنەگرێت تاکو

دڵنیا دەبێت لە توانای ، هەروەها لە تێگەیشتنی زمانی عەرەبی و نوتقی بۆ پیتەکان و شارەزابوون لە (مخارج و صفات و احكام)، پێویستە چەندین کتێبی بۆ دیاری بکات بیخوێنێتەوە و دواتر تاقیکردنەوەی بۆ بکات، بۆ نموونە چەند کتێبێکی سەرەتایی وەکو (تحفة الاطفال و المقدمة الجزرية) و چەند شەرحێکیان، یان ئەگەر ڕیوایەتێکی وەکو وەرش یان قالون ی دەخوێند سەرچاوەی ئەو بابەتە بخوێنیتەوە پێش ئەوەی دانیشێت بۆ خوێندنەوەو گوێگرتن.

به داخەوە لە ئەنجامی پشت گوێ خستنی ئەم مەرجانە و بگرە جاری وا هەیە خودی مامۆستاش ئەوانە نازانێت تاکو قوتابیەکەی فێر بکات ، ئێستا حاڵەتێکی نائاسایی و نامۆ دروستبووە لە کوردستان ئەوەندەی من شارەزا بم لە گەرمیان و سلیمانی و هەولێر و زۆر ناوچەی تر (زۆربەی حاڵەتەکان)کێبڕکێ تەنها بۆ وەرگرتنی ئیجازەیە نەک بۆ فیر بوونی زانست، ئەمەش نەپاراستنی ئەمانەتەو سووککردنی زانستێکی مەزنە وەکو زانستی قیرائات کە پەیوەندی بە کیتابی الله تعالى هەیە و ئەگەر بێت و مامۆستایانی بە توانا و لایەنە پسپۆڕ و بەرپرسەکان فریای ئەو بارودۆخە نەکەون چەند ساڵێکی تر گەورەترین زیان بەو زانستە دەکەوێت و چەمکەکان هەمووی ئاوەژوو دەبێتەوە.

❊ ❊ ❊

## مۆڵەت پێدراو نابێت لە قورئان خوێندندا هەڵە بکات

ئەو کەسەی دەبێتە خاوەنی ئیجازەی قورئان خوێندن واتە دەبێتە مامۆستا و دەتوانێت لە ڕووی کردەیی و تیۆرییەوە دانیشێت بۆ فێرکردنی خەڵکی، سەرەکیترین مەرجەکانی ئەوەیە بە هیچ شێوەیەک لە خوێندنەوەی قورئاندا هەڵە نەکات، نەهەڵەی ئاشکرا (جلي) و نەهەڵەی شاراوە (خفي)، سەرباری ئەوەش پێویستە ئەوەندە سەرچاوەی خوێندبێتەوە لە زانستەکەدا بتوانێت قوتابییەکەی بە پێی بنەماکانی زانستی قیرائات فێر بکا، ئەوەندەش ئەزموونی هەبێ و گوێی لە قورئان گرتبێ بتوانێت هەڵەی ورد چاک بکاتەوە، چونکە خودی مامۆستا هەر کەمتەرخەمی و کەم و کورتییەکی هەبێ بە ئەندازەیەکی زیاتر لە فێرخوازەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە و، شلگیری لەم بوارەدا دەبێتە مایەی نەهێشتنی شکۆی ئیجازەی قورئانی و نە ئامانجی ئەو مۆڵەتە دەپێکرێ و ونە ئەو کەسەش بە مۆڵەتیکی ناشاییستە دەبێتە مامۆستا ئەمڕۆ ژمارەیەکی زۆر لەوانەی مۆڵەتیان وەرگرتووە نازانن بە جوانی قورئان بخوێننەوە، گەر تاقیکردنەوەیان بۆ بکرێت لە ڕووی تیۆری لە پرسیارە سەرەتاییەکانی تەجوید دەرناچن چجای وردەکاری قیرائات! من بە ڕاشکاوی پێم باشە ئەوە باس بکەم کە ئەمرۆ لە کوردستاندا زۆرێک لەوانەی ئیجازەی قورئان خوێندن وەردەگرن شاییستەی نین و ئەم پرسە بەسەرەتایەکی لاواز و هەڵە لە کوردستان دەستی پێکردووە و پێویستی بە ڕاستکردنەوەی ئاراستەکەی هەیە لە لایان مامۆستایانی بە تواناو دەستەی پسپۆڕ لە زانستی قیرائاتدا، گەر بێت و ئیجازە بریتی بێت لەمەی لای خۆمان دەگوزەرێ ئەوا دوای چەند ساڵێک بە جارێ ئەم زانستە لە ناوەڕۆک بەتاڵ دەکرێت و تەنها ئەوەی دەمێنێتەوە ناوێکی گەورەو شارێکی وێران.

## ئایا دەگونجێت قورئان خوێن مونافیق بێت؟

پرسیار: ئایا فەرموودەی (اكثر منافقي امتي قراؤها) فەرموودەیەكی سەحیحە و ئایا ئەو قورئانخوێنانە دەگرێتەوە كە بوونە بە پیاوی ستەمكاران و پشتگیرییان لێ دەكەن؟

شارەزایانی فەرموودە كە بە دوای ڕێگەكانی ئەم فەرموودە ڕۆیشتوون دەفەرموون: (أَكْثَرُ مُنَافِقِي أُمَّتِي قُرَّاؤُهَا) واتە: زۆربەی مونافیق و دوو ڕووەكانی ئوممەتەكەم قورئانخوێنەكانە. عبدالله بن المبارك لە كتێبی (الزهد) و پێشەوا احمد بن حنبل لە (المسند) ڕیوایەتیان كردووە و فەرموودەناس البوصیري لە كتێبی (اتحاف الخیرة المهرة) سەنەدەكەی بە صحیح زانیوە و هەروەها لە فەرمووودناسە هاوچەرخەكان ماموٚستایان احمد شاكر و ناصرالدین الألباني تصحیح یان كردووە، بەڵام هەندێ لە ڕێگەكانی وەكو ئەو ڕێگەی لە (معجم الطبراني) دا هاتووە بەهۆی كەسێك لە زنجیرەی ئیسنادەكەیدا بەناوی (الْفَضْلُ بْنُ الْمُخْتَارِ) بە لاواز حوكمی لەسەر دراوە. لە كۆی قسەی فەرموودەناساندا وا دەردەكەوێت كە فەرموودەكە سەحیحە و بەلای كەمەوە فەرموودەیەكی (حسن)ە، بەڵام لە ڕووی ئەمانەتیشەوە هەندێ لە زانا گەورەكانی وەكو احمد بن حنبل كە صالح ی كوڕی پرسیاری سەنەدی ئەو فەرموودەی لێ دەكات سەحیحە یان نا، ڕادەوەستێت و دەڵێت الله اعلم نازانم سەنەدەكەی چۆنە. هەروەها هەندێ لە زانا هاوچەرخەكان وەكو مصطفى العدوي بە گشتی فەرموودەكەیان بە لاواز زانیوە... والله اعلم.

سەبارەت بە مەعنای فەرموودەکە هەندێ قسەو شیکردنەوە هەڵدەگرێت لە چەند خالێکدا کورتی دەکەینەوە:

١ - وشەی (قراء) بە پلەی یەکەم قورئانخوێنان دەگرێتەوە، بەڵام هاوکات لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بە مەعنای زانا و شارەزا لە شەرعدا بەکارهاتووە، بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ (قراء)ی دەنارد بۆ دەڤەرەکان بۆ ئەوەی خەڵکی فێری ئیسلام بکەن واتا شارەزا بوون لە حوکمەکانی ئیسلامدا، بەڵام لەسەر زاهیری وشەکە زیاتر هەندێ جۆر لە قورئانخوێنان دەگرێتەوە.

٢ - قورئانخوێن بەتایبەتی کاتێک ناوبانگ دەردەکات، ئیتر دەکەوێتە بەرانبەر تاقیکردنەوەیەکی سەخت، چونکە دەرگای لەخۆباییبوون و بەخۆ سەرسام بوونی بۆ والا دەبێت و بەو هۆیەشەوە زۆر جار پێیان دەخلیسکێت و دەچن بە دەم دەعوەتی نانخواردن و رێزلێنانی دەوڵەمەند و بەرپرسەکان و وەلامی بانگهێشتی بێ باوەڕان و ستەمکاران دەدەنەوە کە دەیانەوێت بەهۆی ئەو قورئانخوێنانەوە ڕووی خۆیان سپی بکەن و عاتیفەی خەڵکیی بۆ خۆیان ڕابکێشن، هەروەها تووشی فیتنە دەبن بەهۆی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن وتۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وبەردەوام خۆیان عەرز دەکەن و نیەت و ئیخلاسیان لەو نێوەندەدا لەکەدار دەبێت و بەو شێوەش سەرکێشی بەدینەکەیانەوە دەکەن و سیفەتی نیفاقیان تێدا دروست دەبێت وەکو لە فەرموودەکەدا هاتووە.

٣ - زانا گەورەکان کە شەرحی ئەم فەرمودەیان کردووە فەرموویانە مەبەست لەوەی کە زۆربەی قورئانخوێنانی ئوممەت موونافیق بن ئەوانەن کە قورئان ئەخوێننەوەو لەبەری ئەکەن بۆ بەدەست هێنانی سوودی دنیایی نەک ڕەزامەندی الله تعالی، یان مەبەست پێی ئەوانەن کە بۆ شوهرەت و بۆ ڕیایی ئەیخوێننەوە و ئیش و بەرژەوەندییەکی دنیاییان بەو قورئانخوێندنە هەیە. البغوي دەربارەی مەعنای فەرموودەکە فەرموویەتی: «اكثر منافقي امتي قراؤها» فهو ان يعتاد ترک الإخلاص في العمل. واتە ڕابێت لەگەڵ نەبوونی اخلاص و ئاراستەکردنی نیەت بۆ تەنها الله لە قورئان خوێندنەکەیدا و بەردەوام بیری لای ئەوە بێت نموونە چۆن شوهرەت بەدەست بهێنێت و خەڵکی بیناسن یان بەزمانی ئەم سەردەمەی خۆمان خەو بەوە دەبینێت کەی لایکی یوتیوب و پەیجەکەی بگاتە هەزاران و ملیۆنان، ئەو جۆرە هیواو ئاواتانە لە گەڵ اخلاص و پاک و بێگەردی نیەتتدا تێکدەگیرێن.

٤ - هەندێک لە زانایان فەرموویانە مەبەست لە نیفاقی عەمەلییە نەک بیروباوەڕ و عەقیدەیی، چونکە لە زاهیر وا دەریدەخەن تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی الله یە و لە ڕاستیشدا وێڵن بەدوای بەدەستهێنانی شوهرەت و پارە و پلە و پایە بە هۆی ئەو قورئانخوێندنەوە.

٥ - یان مەبەست لەوانەیە بە جوانی قورئان دەیخوێننەوە و خەڵکی بە خوێندنەوەو بە دەنگخۆشییان کاریگەر دەبن، لە کاتیکدا خۆیان کاری پێ ناکەن و بە پێچەوانەی ئەو ئایەتانەی کە دەیخوێنن کار دەکەن، بۆیە سیفەتی نیفاق و هەڕەشەی فەرموودەکەیان بەردەکەوێت.

٦ – پێشەوا شمس الدين الذهبي لە کتێبە ناوازەکەیدا (زغل اعلم) هێرشێکی توند دەکاتە سەر قورئان خوێنانی سەردەمی خۆی و بە زێدەڕەویی و خۆتێکدان و بە ئەنجامدانی ڕیایی تۆمەتباریان دەکات و دوعای شەڕیان لێ دەکات، واتە مەسەلەی قورئانخوێنان لە هەموو سەردەمێکدا ئەو جۆرە نیفاق وڕوپاماییەیان تێدایە، دەربارەیان دەڵێت: (وآخر منهم إن حضر في ختمه أو تلا في محراب جعل ديدنه إحضار غرائب الوجوه والسكت والتهوع بالتسهيل وأتى بكل خلاف ونادى على نفسه أنا أبو فلان فاعرفوني! فإني عارف بالسبع!! إيش يُعمل بك لا صبحك الله بخير؟ إنك حجر منجنيق ورصاص على الأفئدة!!.) واتە: کەسی وایان هەیە دێت و لەناو میحرابی مزگەوتەکەدا بە شێوازە غەریبەکانی قیرائات قورئان دەخوێنێت و دەڵێت بمناسن من باوکی فلانم و شارەزای قیرائاتی سەبعەم! الذهبي ش پێی دەڵێت چیت لێ بکەین باوکی فلانی؟ دەک بەخێر نەیەیتەوە! تۆ بەردی مەنجەنیقی و وەکو قوڕقۆشم قورسی لەسەر دڵمان!

٧ – پێم وایە ئەم فەرموودەیە هەڕەشەیەکی ترسێنەرە و مایەی بیرکردنەوەو وەستانێکی دوورودرێژە بۆ ئەو پێشنوێژ و قورئانخوێنانەی بەردەوام نوێژو پێشنوێژی خۆیان لە حاڵی گریان و خشوع و دەنگ لەراندنەوەدا تەسویر دەکەن و لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بڵاو دەکەنەوە، ئەو زیدەڕەوییە بە کارێکی باش نازانم بۆ ئەو پیاوە بەڕێزانە و بە ڕێگرێک دەیبینم بۆ سافی و بێگەرد بوونی نیەت و کردەوەکانیان بۆ الله تعالى، چ پێویستییەکیان بەوە هەیە بەو شێوە قورئانخوێندن و کارە چاکەکانیان بۆ خەڵکی نمایش بکەن و خۆیان وەکو کەسێکی لەخواترس و بەتەقوا و موتتەقی نیشان بدەن، بێگومان مەبەست لەوە نییە کەسێک دەنگی خۆش

بێت و خوێندنەوەی ڕاست و جوان بێت لەترسی ڕوپامابیدا قورئان خوێندنی خۆی بڵاونەکاتەوە نەخێر، بەڵکو مەبەست لە ئەو زێدەڕەوی و سنووربەزاندنەیە کە ئەمڕۆ بەداخەوە زۆرێک لە قورئانخوێنان سیفەتی خۆنمایش کردنیان بەسەرەوە زاڵە و وەکو ئەوەی کارەکەیان زۆر شەرعی بیت و هیچ مەترسییەکی لەخشتەچوون و ڕیاییان لەسەر نەبێت.

٨ – جۆرێکی تریش لەو قورئانخوێنانەی کە ئەم فەرمووده دەیانگرێتەوە والله اعلم ئەوانەن کە بوونەتە پیاوی سەرۆک و دەسەڵاتدارە ستەمکارەکان و بە شێوەیەک لە شێوەکان ڕووی ئەوان سپی دەکەنەوەو بەڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بەرگرییان لێ دەکەن، وەکو ئەو قورئانخوێنەی کە ئێمە ساڵانێکە بە قورئان خوێندن و سروودەکانی کاریگەر بووین کەچی پشتگیرییەکی بێ وچان و بێ شەرمانە بۆ هەندێ زاڵم و دوژمنانی ئیسلام دەردەبڕێت، کردەوەکانی وا نیشان دەدات کە ئەو نان بەو قورئانەوە دەخوات کە بەو دەنگە خۆشەی دەیخوێنێتەوە، ئەگینا الله اعلم بەوەی لە ناخی و لە حەقیقەتی حاڵیدا هەیە لەلای پەروەردگاری ئەوە ئێمە ناتوانین قسەی تێدا  بکەین. بەڵام بەپیی دەقەکانی قورئان و سونەت زاهیرەکەی زاهیرێکی باش نییە.

٩ – ئەمڕۆ بە هۆی تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان و ئەو سەکۆ زۆرانەی کە بەردەستە بۆ هەموو کەسێک، ڕێگا و دەرگای فیتنەیەک لە دینداریدا و بەتاییەت بۆ قورئانخوێنان لەسەر پشت کراوەتەوە، بەتاییەتی بۆ ئەوانەی کە دەنگیان خۆشە بەڵام هیچ بنەمایەکی زانستی شەرعی بەتاییەتی لەلایەن عەقیدەو بیروباوەڕیان نییە کە لەسەری ڕاوەستن و کەسایەتییەکی

موسوڵمانی هاوسەنگی بۆ خۆیان پێ درووست بکەن، ئەوانە ئەگەری لەخشتەچوون و تووشبوونی ڕیایی و وێڵ بوون بەدوای شوهرەت و ناوبانگ دەرکردنیان هەیە، مرۆڤیش ئەوەندەی باشە مەشهور نەبێت، ئەگینا کە مەشهور بوو ئیتر کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دەر دەچێت و دەرگای تەئویل و پینەوپەڕۆ لەخۆی دەکاتەوە و جیهانێکی خەیاڵی و وەهمی بۆ خۆی دروست دەکات و ڕەزامەندی خەڵکی و بەدەستهێنانی پلەو پایەو سومعە و پارەو سامان دەبێت بە خولیای ﴿الا ما رحم ربي﴾ چونکە ئوممەتی ئیسلام خەڵکی چاک و خۆیەکلاکەرەوەی بۆ ئیسلام لێ نابڕێ.

١٠ – ئامۆژگارییەکی برایانە و دڵسۆزانەم بۆ هەموو ئەو بەڕێزە قورئانخوێنە دەنگ خۆشانە هەیە کە لە ڕاگەیاندنەکان و تۆرە کۆمەڵایەتییەکاندا قورئان خوێندنی خۆیان بڵاودەکەنەوە وڕۆژ لە ڕۆژیش ژمارەیان لە زۆربووندایە کە:

* وریا بن لە گەڕان و وێڵ بوون بە دوای شوهرەتدا، ئەوە ڕێگایەکی پڕ لە مەترسییە بۆ دینەکەیان، چونکە ئەگەر تووشی کەمترین ڕیایی و ڕوپامایی ببن ئەوە بە شیرکی بچوک دادەنرێت و لە سەرووی تاوانە گەورەو کەبائیرەکانەوەیە.

* با شوهرەت خۆی بێت بۆلاتان ئەگەر خێری پێوە بوو، نەک ئێوە بەهەموو توانایەکتانەوە بەرەو لای برۆن! ئێوە هەڵپە و کۆششی بۆ مەکەن چونکە لەو حاڵەتەدا ئەستەمە نیەتی خزمەتی دین و بەدەستهێنانی سوودی دونیایی بەهۆی قورئانەوە لەیەکتر جیابکەنەوە.

* پێش ئەوەی قورئان بخوێنن بۆ خەڵکی وخوێندنەوەی خۆتان نمایش بکەن، خۆتان لە تەوحید وبابەتەکانی عەقیدەو بیروباوەڕ و بابەتەکانی بژاری دەروون (تزكية النفس) دا شارەزا بکەن، بۆ ئەوەی سنوورەکانی نەبەزێنن و کاروکردەوەی خۆتان پوچەڵ نەکەنەوە بێ ئەوەی بە خۆتان بزانن، چونکە تا شارەزای هێڵە سوورەکانی عەقیدەو شەرع نەبیت ناتوانیت خۆتیان لێ بپارێزێت.

* ئەوەش بزانن ئێوە هەرچەند شوهرەت بەدەست بهێنن و دەنگتان خۆش بێت ئەستەمە نە ئەوەندەی (مشاري العفاسي) دەنگتان خۆش بێت و نە ئەوەندەی ئەویش ناوبانگ دەربکەن و دەوڵەمەند بن، کە دەچێتە وڵاتێک سەرۆکی وڵاتەکە پێشوازی لێ دەکات، بەڵام تەماشای بکەن ئەو شوهرەت و سەروەت و سامانەی لە بەرانبەر چەند تەنازولی گەورە لە دینەکەیدا بەدەستی هێناوە و ببینن چۆن مەدح و سەنای زاڵمان دەکات و بەخۆشحاڵییەوە وێنەیان لەگەڵدا دەگرێت و ستایشیان دەکات! سروود بەباڵایاندا دەڵێت!

*پەند لەوەش وەربگرن کە عەففاسی وهاوشێوەکانی چۆن ئەگەر لەسەر ئەو ڕێبازە ناشەرعی و هەڵەیە بەردەوام بن شوهرەتەکەیان سەریان دەخوات و مایەپووچی قیامەتیان دەکات، عەففاسی بکە بە پەند و عیبرەتێک بۆ خۆت و داواش بکە لە الله عزوجل هەرگیز ناوبانگ و شوهرەت و پارەو سامانی لەو جۆرەت پێ نەدات.

* هەروەها داواتان لێ دەکەم گریان و خشوع و سیمای لە خواترسانی خۆتان بۆ خەڵکی نمایش نەکەن و تا پێتان دەکرێت بیشارنەوە، سەلەفی ئەم ئوممەتە گریانی خۆیان تەنانەت لە خێزانەکانی خۆیشان دەشاردەوە و لە ناو دەرس و وانەی شەرعیدا کە لەترسی الله گریان ڕێی پێ دەگرتن دەیانوت هەڵامەت نەخۆشییەکی بێزارکەرە! چونکە ئەو دەرگایەکی پر لە مەترسی ڕوپاماییت لێ دەکاتەوە، الله بەسە بزانێت کە تۆ خاوەن تەقواو خشوع ی، چ ئیشێکت بە مرۆڤەکانە ئەوە بزانن.

❊ ❊ ❊

## پەیامێك بۆ فێرخوازانی زانست و قورئان بەتایبەت

لە دیاردە جوانەکانی ئەم قۆناغەی ئێستای خۆمان ئەوەیە، ئافرەتان بە ڕێژەیەکی زۆر و بەرچاو ڕوو لە فێربوونی زانستی شەرعی دەکەن و بەتایبەتی بە زانستی تەجویدو قیرائاتی قورئانەوە سەرقاڵ دەبن، ئەوەش بێگومان کارێکی باشەو مایەی دڵخۆشییە، بۆیە پێویستە لەم زنجیرەیەدا کۆمەڵێک تێبینی و ئاگادار کردنەوەیان ئاراستە بکەین لە وێنەی پەیامێکی پێویستدا:

١ - هەرچیت کرد لە بازنەو سنووری شەرعدا بیکە، واتە ئەگەر ئەو بابەتەی کە دەیخوێنیت و بە وانە وەریدەگریت، تەنها ئەوە بەس نییە، کە خۆی لە خۆیدا کارێکی باش و شەرعی بێت، بەڵکو دەبێت لە کەش و هەوایەکی شەرعی و دوور لە هیچ سەرپێچی و هەڵەیەکی شەرعی وناپەسەند ئەنجام بدرێت، وەکو تێکەڵ بوون لەگەڵ پیاوان و هەندێ حاڵەتی تر کە هەوڵ ئەدەین ئاماژەیان پێ بکەین.

٢ - چاک بزانە و دڵنیابە، هەرچی زانستێک بخوێنیت و فێری ببیت، ئەگەر لەسەر بنەمای عەقیدەو تەوحید نەبێت و پێشتر کەسایەتی ئیسلامی خۆت لەسەر بنەمای تەوحید تۆکمە نەکردبێت، هیچ سوودێک نابێت و دەبێتە زانستێکی بێ گیان و ساردوسڕ و لە الله تعالی نزیکت ناکاتەوە، بۆیە هەرچیت خوێند دەبێت هەم لەسەر بنەمای عەقیدە بێت وبە هەموو شێوەیەک بە عەقیدەوەی ببەستیت.

٣- بنچینەیەکی نەگۆڕ وجێگیرە لە ئیسلامدا، کە علم بریتییە لەوەی قال الله و قال الرسول ی تێدا بێت و پێویستە لەو دوو بنچینە مەزنەوە سەرچاوەی گرتبێت، بۆیە دەبێت ئەرکی زانستی سەرەکی ولە پێشینەت پێش هەموو زانستێک بایەخدان بێت بە قورئان و زانستەکانی، هەروەها سوننەت بکەیتە نەخشە ڕێگای دونیاو دوارۆژت، لەو بارەشەوە پێویستە بزانیت:

- ئەسڵ لە قورئاندا ناوەڕۆک و بەرنامە و عەقیدەکەیەتی، بۆ نموونە ئەگەر هەر فێرخوازێکی زانست هەر خەریکی تەجوید بوو و کاتی نەبوو خەریکی تەوحید بێت، ئەوە بزانە کە ئەو کەسە لێیی تیکچووە و کات بەزایە دەبات، چونکە تەوحید ئامانجە وتەجوید هۆکارە، هەڵەیە قیرائات وجوان خوێندنەوەی قورئان بکەیتە ئامانج وتەمەنی پێوە سەرف بکەیت، بەو کارەت ستەم لە خۆت دەکەیت، بۆ نموونە تۆ پێویستت بە خوارنێکی خۆش و وزەبەخشە بیخوێت، تەوحیدو بەرنامەو حوکمەکانی قورئان ئەو وزەو خواردنەیە کە تۆ پێویستت پێیەتی، بەڵام تەجوید وجوانخوێندنەوەو مەخاریج وسیفات ئەو دەفرەیە کە خواردنەکەی تێدا دەخۆیت، نەک خۆی خواردنەکە بێت! ڕاستە دەبێت ئەو دەفرە خاوێن وجوان بێت، بەڵام دواجار هۆکار ویارمەتیدەرە نەک خۆی ببێتە مەبەست وئامانج، کە بەداخەوە ئێستا لە کوردستاندا کار بۆ ئەو ئاراستەیە دەکرێت.

- ئەم سەردەمەی خۆمان بە هەموو مەعنایەک سەردەمی فیتنەیە و ئافرەت دەبێت زۆر وریا بێت لە جۆرێک لە جۆرەکانی فیتنە تێوەنەگلێت، پێت سەیر نەبێت ئەگەر پێت بڵێم ئەگەر خاوەن زانست وهوشیار و وریا نەبیت هەر بەبەهانەو پاساوی فێربوونی قورئانەوە دینەکەت لەکەدار دەکرێت

و کاتێک دەزانی لە جیاتی قازانج سەرمایەکەشت لەدەستداوە، چارەسەریش لەوەدا ئەوەیە ئیمان وتەوحیدو عەقیدەی سەلەف بکەیتە پێوەر بۆ هەموو شتێک وبۆ هەڵسەنگاندنی هەموو کەس وتەوژم ولایەنێک .

- حەقیقەتێک هەیە ئەویش ئەوەیە لە کۆمەڵگای خۆماندا هەستی ئایینی زاڵە بەسەر خەڵکیدا وبەتایبەتیش ئافرەتان، جا دەسەلاتداران وخاوەن بەرژەوەندییەکان و سیاسەتمەداران پەنا بۆ ئەوە دەبەن لە ڕێگەی کارکردن لەسەر ئەو هەستەوە کەسەکان بکەن بە لایەنگرو خزمەتکاری ناڕاستەوخۆی خۆیان، ئەم حەقیقەتە تاڵە لە کوردستانیشدا بوونی هەیە بابزانیت.

٤ - بە هیچ شێوەیەک درووست نییە لە لای مامۆستای پیاو قورئان و تەجوید و قرائات و زانستەکانی تر فێر ببیت، ئەوە ڕێگایەکی فیتنەیە و وەکو ئەوەیە بە ئاوێک کە پاراو نەبێت دەستنوێژ بگرێت، واتە ئامانجەکە شەرعییە و ڕێگەکە ناشەرعییە.!

٥ - لە کاتی فێربوونی تەجوید و قیرائاتدا وریای ئەوەبە کە تووشی بیدعە نەبیت، چونکە زانستی قیرائات بیدعەو قسەی بێ بنەمای تێدا هەیە تەنها بە زانستی شەرعی و شارەزابوونی باش لە سوننەت دەتوانیت لێی بەدوور وسەلامەت بیت، بۆ نموونە ئەو تەکبیراتەی کە لە کاتی تەواوکردنی خەتمەیەکدا لە لای مامۆستایەک پێت دەکرێت ئەوە ئەسڵی نییە و ئەو ڕێگەش کە لێیەوە هاتووە زۆر لاوازە و زانایانی فەرموودە ناس نکۆڵییان لە زنجیرەسەنەکە کردووە و فەرمویانە ئەو تەکبیراتەی لە کۆتایی سوڕەتی (الضحى) وە دەکرێت بیدعەیە و ئەسڵی نییە.

٦- هەندێ لە ناوداران و زانایانی زانسی قیرائات زۆر پابەندی سوننەت نابن ئەوەندەی کە پابەندی زانایانی قیرائات دەبن چییان کرووەو چۆنیان خوێندووەتەوە هەروا دەکەن و مەسەلەکان بەبەڵگەی سوننەت و فیعلی سەلەف یەکلا ناکەنەوە، ئەوەش هەڵەیە و فێرخوازی زانست ناچار نییە لە هەموو شتێکدا شوێنکەوتوویان بێت، چونکە دینداری لە هەموو بوارێکدا بە قیرائاتیشەوە لە ڕۆشنایی کیتاب و سوننەتدا دەبێ بکرێ. نابێ بوترێ ئێمە شوێنکەوتووی سوننەتی قورئانخوێنانین چییان کردووە شوێنپێیان هەڵدەگرین، زۆرێک لە گەورەترین وبەناوبانگترین زانایانی قیرائات سۆفی بوونەو جێبەجێکردنی سوننەتیان بەلاوە مەبەست نەبووەو ئەنجامدانی بیدعەش بەلایانەوە زۆر کارێکی ئاسایی بووە، ئیتر چۆن دەبێ فێرخوازێکی قورئان وقیرائات کوێرانە وبەبێ زانینی بەڵگەکانیان شوێنیان بکەوێت.

٧- زۆربەی ئەمانە لە کوردستاندا خەریکی زانستی تەجوید و قیرائاتن، سەر بە چەند لایەنێکی حیزبین و بەرنامەی سیاسی وحیزبی خۆیان هەیە کە کاری بۆ دەکەن و بەرپرسیان هەیە و دەبێت گوێڕایەڵیان بن وحیساب بۆ زۆر شت بکەن، بەڵام فێرخوازی قورئان ئاگای لەو کەین وبەینە نییە و وەکو ئامراز بەکار دێت، بۆیە ئەوانیش وەکو مامۆستایانی ئایینی ناتوانن حەق وەکو پێویست بەیان بکەن، چونکە دەبێت دڵی خەڵکی و دەسەڵات و دەنگدەر و لایەنگر هەمووی ڕابگرن و وەزعەکە لە خۆیان ئاڵۆز نەکەن وتا بکرێت دڵی کەس لە خۆیان نەڕەنجێنن، دینداریش ئەو هەموو ڤشارەی لەسەر بێت زۆر جار حەق وصواب تیا دەچێت لەو بەینەدا. زانینی ئەم مەسەلەی ئاماژەم پێکرد زۆر کێشەت بۆ حەل دەکات و وەڵامی زۆر پرسیارت بۆ دەداتەوە.

٨ – پێویستە مامۆستای تەجوید و قیرائات بە شێوەیەکی عەمەلی و وەکو بەرجەستەکردن، خوێندکارەکەی فێری ئەوە بکات لە سەر هەموو ئایەتێکی تەوحید و ئیمان و عەقیدە بوەستێت و تەنها خەریکی تەجوید و مەخاریج و صفات نەبێت، ئەو ئایەتانە بۆ تدبر وکارپێکردن دابەزیون، نەک بۆ ئەوەی تەنها خەریکی زانینی مەخاریج وسیفات وحوکم وشێوازی خوێندنەوەی پیتەکانی بیت وسالآن بەوە تەواو بکات.

٩ – بزانە لای کێ وانە دەخوێنێت، تەنانەت لە مەسەلەی عەقیدەشدا نابێت تەنها بە بانگەشەو قسەی ئەو کەس ولایەنانە قایل ببیت کە خۆیان وا وێنا دەکەن خاوەن عەقیدەیەکی ڕاستن، بەداخەوە هەندێک مامۆستای ئافرەت پەیدا بوونە کە لافی عەقیدەی ڕاست ودرووست لێ دەدەن و لەڕاستیشدا وا نین وبە پێچەوانەوە ئافرەتانێکی زۆر بەو بانگەشە بێ بنەمایەی خۆیان فریو دەدەن.

١٠– ئامۆژکاری هیچ خوشکێکی بەڕێز ناکەم لەگەڵ هیچ لایەنێکی حیزبی و سیاسی با ئیسلامیش بێت کار بکات، نە وانەی قورئان وزانستی شەرعیشیان لە لابخوێنێت، نە بە ڕاستەوخۆ، نەش بە ناڕاستەوخۆ کە ئێستا زۆر دەزگای تایبەتمەند بە زانستی شەرعی وتەجوید وقیرائات پەیدابوونە بە زاهیر بێ لایەنن و لەحەقیقەتیشدا سەر بە هەندێ لایەنی دیاری کراون و ئەو ناوەندانە دەکەن بە بیانوو هۆکارێک بۆ ڕاکێشانی خەڵکی بۆ ئەو لایەنانەی سەر بە ئەوانن. لەم سەردەمەی خۆماندا کە لادانی مەنهەجی وعەقیدی لە ئیسلام بووەتە دیاردەو واقعێکی تاڵ، بێ لایەنی سەربەخۆیی ڕاستەقینە بکە بەو قەڵغانەی دینەکەی خۆتی پێ دەپارێزیت ومامەڵەشت با لەگەڵ خەڵکی بێ لایەن بێت.

## ڕەخنەکانی (شمس الدین الذهبي) لە قورئانخوێنانی سەردەمی خۆی

یەکەم وێستگەو ڕاوەستانی شمس الدین الذهبي الترکماني لە کتێبی (زغل العلم) دا لەگەڵ قورئانخوێنان و شارەزایانی عیلمی قیرائاتە، کە خۆیشی یەکێکە لە ناودارانی ئەو زانستە لەسەردەمی خۆیدا، بە وردی-و جیاواز لە سروشتە نەرم ونیاینەکەی خۆی- بە توندی و زۆر بە توڕەیی هەڵە و پەڵە و سەرکێشییەکانیان دەستنیشان دەکات و بێزار بوونی خۆی لەسەری دەردەبڕێت.

لە دەسپێکی ڕەخنەکانی لە بەرانبەریاندا دەڵێت: قورئانخوێنان زێدەڕەوی زۆریان تێدایە، بێ ئەوەی پێویست بکات پرسەکانی تەجوید و شێوازی خوێندنەوەکان زۆر ورد دەکەنەوە، ئەوەندە گرنگی بە چۆنیەتی خوێندنی پیتەکانی قورئان دەدەن بیریان لەلای خشوع ومەعنا و واتاکانی هەر نەماوە، بە بێزارییەکی زۆرەوە ڕوویان تێدەکات و دەڵێت: ئێوە پێتان وایە غەیری خۆتان نازانن بە جوانی قورئان بخوێننەوە، ئەی پێم بڵێن ئێوە چ کردەوەیەکتان بە قورئانەکەتان کرد! ئێوە کردەوەکانتان چاک نییە و خوێندنەوەکەشتان زۆر قورس و ناخۆشە، خشوع و لە الله ترسانی پێوە دیار نییە! دەپاڕێمەوە الله لە خەوی ڕیایی و نەفامی بێدارتان بکاتەوە!

بێگومان ئێستا لەسەردەمی خۆماندا ئەو دیاردە ناشەرعییانە زیاتر بوونە و لەلای زۆرێک لە قورئانخوێنان قورئان خوێندن بووەتە هۆکارێک بۆ خۆهەڵنان و توانای خۆ دەرخستن لە درێژی هەناسە و خوێندنی چەندین ئایەت بە یەک هەناسە و دەنگ لەراندنەوە و بە ئاواز و ئەلحان خوێندن و

تەقلید کردن و تەنانەت لە هەندێ جێگا ئەوەش پەیدا بووە کە قورئان لەگەڵ مۆسیقا دەخوێندرێت، جاری واش هەیە لەگەڵ گۆرانی بێژەکاندا پێکەوە لەسەر شانۆ چالاکی هاوبەشیان هەیە، بەتایبەت ئەوانەی کە زۆر گرنگی بە مەقامات دەدەن هەست دەکەیت قورئانخوێندنەکەی لە گۆرانییەوە نزیکترە و هیچ گومانێک نییە لەوەی ئەو جۆرە قورئانخوێندنە حەرامە و هەر ئەوەشە کە پێشەوا الذهبي بەو شێوە بێزار و تورە کردوە لە قورئانخوێنانی سەردەمی خۆی.

ئینجا ڕوو دەکاتە ئەوانەی کە دەنگی خۆیان زۆر خۆش دەکەنەوە و بە شێوازێکی حەزین قورئان دەخوێنن، دەڵێت ئەوانە ڕەنگە خەڵکی سوودیان لێ وەرگرێت و بەدەنگیان کاریگەر بێت، بەڵام هەر بەدوای ئەو قسەدا، هێرشێکی توند دەکاتە سەر ئەو قورئانخوێنانەی کە لەلای جەنازەو لە پرسەکاندا قورئان دەخوێنن، دیارە لەسەردەمی الذهبي بەهەمان حاڵی ئێستای موسوڵمانان ئەو دیاردە ناشەرعی و ناشیرینە هەبووە کە کەسانێک بە قورئان کەسابەت بکەن و بیکەن بە هۆکارێک بۆ پەیدا کردنی بژێوی ڕۆژانەیان بەبێ گوێدان بەوەی کە ئەو کارە بیدعەیە و فرۆشتنە بۆ ئایەتەکانی الله یە بە نرخێکی هەرزان!

ئینجا ڕەخنەیەکی توند لەوانە دەگرێت کە لەسەردەمی خۆیدا خەریکی زانستی قیرائاتی عەشرە و سەبعەن و دەڵێت زیاد لە پێویست خەریکی شێوازەکانی حەمزەو وەرشن! هەر خەریکی ناسک کردنی پیتی ڕا و قەڵەو کردنی پیتی لام و زێدەڕەوی لەو بابەتانە دەکەن و موسوڵمان بەو هۆیەوە هیچ چێژ لە خوێندنەکەیان نابینن.

بێگومان لەم سەردەمەی خۆیشمان ئەوانەی بەو شێوە دەخوێنن تووشی هەڵەی زانستی و شەرعی دەبن جگە لە مەترسی ڕوپامایی و حەزی خۆ دەرخستنیش دەڵێت: (اقرا یارجل واعفنا من الغلیظ و الترقیق) واتە بخوێنە و واز لە دووبارەکردنەوەی ئەو شێوازانە بهێنە.

ئینجا دەڵێت قورئانخوێنی وا هەیە کاتێک لە جێگەیەکدا قورئان دەخوێنیت، یان پێشنوێژی دەکات، هەموو توانایەکی خەرج دەکات لە هێنانی شێوازە نامۆکان و خۆ خەریک کردن لە گەڵ تەسهیلی هەمزە و سەکتەکان و شێوازەکانی تری هەندێ ڕیوایەتی قیرائات و دەڵێت من باوکی فلانم و شارەزای هەر حەوت شێوازەکانی قیرائاتی قورئانم بمناسن، جا لە کۆتایی ئەو بەشەدا الذهبي دەڵێت: چیت لێ بکەین کە باوکی فلانی؟ بەڵکو تۆ وەکو بەردی مەنجەنیق و قورقوشم لەسەر دڵمان قورسی.

لە قسەکانی الذهبي لەو کتێبەیدا، دەربارەی قورئانخوێنان و شارەزایانی زانستی قیرائات کە خۆیشی زانایەکی گەورە بووە لەو زانستەدا، دەردەکەوێت کە:

١ - بێزاری لە قورئانخوێنانی سەردەمی خۆی لەوە بووە، خوێندنەوەکەیان خشوع و لە الله ترسانی پێوە دیار نەبووە، خوێندنێکی بێ گیان و بێ تام بووە چونکە هەموو کێشەیەکیان لەوەدا بووە چۆن بەجوانی پیتەکان و شێوەکانی قیرائات دەربکەن و زێدەڕەوی زۆریان لەو بارەوە کردووە؟

٢ - قورئانخوێنان ڕیایی و ڕوپامابیان هەبووە و ئەو سەردەمە لەبەر ئەوەی تۆڕی کۆمەڵایەتی و کەناڵەکانی ڕاگەیاندن نەبووە تا بەردەوام لێی دەربکەون، بۆیە ئەو جۆرە قورئانخوێنانە لە پرسە و سەرقەبران و لە هەندێ کۆڕ و کۆمەڵدا هەوڵیان داوە خۆیان دەربخەن وڕیکلام بۆ خۆیان بکەن و لە قسەکانیدا وا دەردەکەوێت کەسانی خۆشەویست نەبوونە لەلای خەڵکی.

٣ - ئەوەش لە قسەکانی الذهبي وەدی دەکرێت کە هەندێ لە قورئانخوێنان بازرگانییان بە قورئانەوە کردووە و لە بۆنەکاندا بەپارە قورئانیان خوێندووە.

کە ئەو دیاردەیە ئێستەش لەم سەردەمەی خۆماندا بە چڕی وەکو دیاردەیەکی ناشەرعی و ناشیرین بوونی هەیە.

٤ - هەروەها ڕەخنەی لەوە گرتووە کە هەندێک لەوانە تەنها گرنگی بە پیتەکانی قورئان دەدەن و سنوور و واتاکانی پشتگوێ دەخەن، چۆن بڵێیت (حروف) ی قورئان بە جوانی دەردەبڕن بەڵام لە (حدود) ەکانی بێ ئاگان، خەریکی (تجوید)ن، بەڵام لە (توحید)دا لایانداوە و تێکەوتوون، ئەمەش کێشەی ئەو کاتەی ئەوو بەسەد قات زیاتر کێشەی سەردەمی ئێمەشە.

خەریکە لە کوردستاندا نەوەیەک درووست دەبێت، قورئان بە جوانی دەخوێننەوە، بەڵام نازانن پێناسە و واتای (لااله الاالله) چییە، نە دەشزانن هەڵوەشێنەرەوەکان و مەرجەکانی چین، لەوانەشە لە زۆرێک لە قورئانخوێنانی ئێستای خۆمان بۆ نموونە دەربارەی (الولاء والبراء) پرسیار بکەیت یان تەنها ناوەکەی بیستبێت یان یەکەم جاری بێت ئەو وشە

ببیسێت، جا وەرە قورئانخوێنێک ئەوە حاڵی عەقیدەی بێت ڕەفتار و مامەڵەی لەم سەردەمە ئاڵۆز و غوربەتەی ئیسلامدا دەبێت چۆن بێت و چۆن بتوانێت خۆی لە لافاوی جاهیلییەت بپارێزێت کە ئەو ئەسڵەن جاهیلییەتی نەناسیوە و هەست بە هیچ کێشەیەک لەگەڵیدا ناکات !

نەوەیەک لە درووست بووندان وا تێگەیشتوون و تێگەیەندراون، ئەگەر بە تەرتیلێکی جوان قورئان بخوێنیتەوە و لە مەخارج و سیفاتی پیتەکاندا شارەزا ببێت، ئیتر هەر ئەوەندیان لەسەرە و بەوە بەهەشت مسۆگەر دەبێت، با لە عەقیدەش هیچ نەزانن و بکەونە جۆرەها لادان بەبێ ئەوەی بەخۆیشیان بزانن و لا حول ولا قوة الا بالله.

٥- کارەساتیش ئەوەیە ئەم هەڵە تێگەیشتنە بەردەوام پەرەی پێ دەدرێت و هانی بەرەوپێشچوونی دەدرێت، تەنانەت بایەخی ئیجازەی قورئانیش تەواو کەم و کاڵ بووەتەوە، فێرخوازێکی زۆر ئیجازەیان بەسەنەدی نەپچڕاوە هەڵواسیوە و بەتەواوی نازانن قورئان بخوێننەو یان لە ڕووی زانستییەوە بەسەر هەموو بابەتەکانی تەجویددا زاڵ بن، زۆرێک لە مامۆستایانی ئەو زانستە لە ئەسڵی مەسەلەکە لایانداوە و هەندێکیان وەکو دەرگایەکی بژێوی لێی دەڕوانن و شتی زۆر ناخۆش لەو بارەوە دەگێڕنەوە بەداخەوە.

٦ – لەبەر ئەو هەڵە ولادانە مەنهەجی و زانستیانەش کە باسم کرد و لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە زانستە زیانی بۆ کەس نییە و سوودی بۆ خاوەنەکەشی نییە! لەسەر هەموو ئاستەکاندا هانی بەردەوامبوونی ئەو جۆرە چالاکییە دەدرێت و بەردەوام ئاهەنگی دابەش کردنی ئیجازەو بانگهێشتکردنی قورئانخوێنان لە وڵاتانەوە بۆ کوردستان دەکرێت، چونکە قورئان لە ناوەڕۆکی خۆی خاڵی کراوەتەوە بەتایبەتی لایەنی عەقیدەو بیروباوەڕەکەی تەواو وەلاخراوە و کەسیش ﴿إلا ما رحم ربي﴾ هەست بە هیچ شتێکی نائاسایی ناکات لەو بارەوە، لەناو خودی ئەو ئاهەنگانەدا چەندین سەرپێچی زەقی ئەو قورئانە دەکرێت کە ئیجازەیان تێدا وەرگرتووە و بەتەمان بە هەموو پیتێکی پلەیەک لەبەهشتدا بەرز ببنەوە، لەولاشەوە جەهلێکی تاڵ و ناخۆشیان بە دین و بە عەقیدەکەیان هەیە.

٧- بەداخەوە لە بواری سیاسەتیشدا ئەم مەسەلە بەکار دێت و هەر یەکەو هەر لایەنێک هەڵدەستێت دەیەوێت مەسەلەی قورئان و تەجوید و قیرائات بکات بە تەنافێک جۆرەها بابەت و کاڵای ناشەرعی خۆی لەسەری هەڵبخات و پەردە پۆشی زۆر شتی ناشەرعی خۆی پێ بکات. کە بە ئاماژەی ناڕاستەوخۆ ئەم بوارە ترسناکە لە قسەکانی الذهبي دا ئەویش لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی جیاوازی سەردەمەکاندا هەستی پێ دەکرێت.

هەروەها قورئانخوێنانی سەردەمی خۆمان زۆرێکیان دەبینین دەبنە پیاوی زاڵمان و داروودەستەی دوژمنانی ئیسلام، ڕێگەی مەشهوربوونیشیان زۆر جار بەسەر پردی ئەو سەرۆک و حکومەتانەدا تێدەپەڕێت کە هەلی دونیاویستی

ئەو قورئانخوێنانە دەقۆزنەوەو لەڕێگەی ئەوانەوە زۆر بەرنامەی دژ بە ئیسلام تێدەپەڕێنن.

به کورتی قورئان ئێستا زیاتر لەسەردەمی الذهبي تەنها بووەتە تەرتیل و تەجوید و جوانخوێندنەوەو خوێندنەوەیەکی بێ روح و تەواو، بەڵکو لە جوان خوێندنەوەشدا زۆر کەموکورتی و هەڵەیان هەیە و بڕوانامە و ئیجازە بەبێ شایستەبوون و بە ئیعتیباری نازانستی دابەش دەکرێت .

مایەی گریانە کە دەبینیت ژمارەیەکی بەرچاو لە خوێنەران و فێرخوازان و ئەندامی سەنتەر و قوتابخانەکانی قورئان لە کوردستاندا بەسەر ئایەتەکانی تەوحید و عەقیدەدا تێدەپەڕن تەنها بیریان لەلای تەجوید و مەخاریج و سیفاتە، خەتمە لە دوای خەتمە بە فێرخوازان تەواو دەکات بێ ئەوەی لە دە جێگای قورئاندا لەسەر بابەتەکانی عەقیدەو تەوحید بوەستێت لە کاتێکدا قورئان لە بنچینەدا بۆ ئەو مەبەستە دابەزیوە.

تەنانەت ئەو مامۆستایانەی بۆ وتاردان لەو جۆرە ئاهەنگانە بانگهێشت دەکرێن، تەنها و تەنها جەخت لەسەر جوان خوێندنەوەی قورئان دەکەنەوە و باسی ئەوە ناکەن ئەگەر لەگەڵ ئەوەدا تەوحیدت تەواو نەبێت هەمو تەمەنت بۆ تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئان و قیرائات تەرخان بکەیت سوودی نییە.

٨ - بێ گومان شمس الدين الذهبي لەو کتێبەیدا زیاتر مەبەستی بووە کە دیاردە پێچەوانەکان لەگەڵ شەرعدا دیاری بکات و زانستی ئیسلامی لەوەی ناوی ناوە زەغەل و فێڵ وهەڵە پاک بکرێتەوە و زیاتر مەبەستی ئەو جۆرانە بووە نەوەک حوکمێکی گشتی بەسەر قورئانخوێنان و زانایانی قیرائاتدا دابێت.

هەر وەکو چۆن ئەم دیاردە نامۆ و ناشەرعییانەی ئێمەش ئاماژەمان پیکرد لە کوردستاندا حاڵی زۆرینەیە نەک ئەوەی هەموو ئەوانەی کە گرنگی بە تەجوید و زانستی قیرائات دەدەن لە کوردستاندا لەو جۆرە بن. ئەوە بێ ئینسافییەکە من لێی بەریم ئەو قسە بکەم، بەڵکو تێیاندا هەیە زۆر بایەخ بەڕاسکردنەوەی عەقیدەی خۆیان و عەقیدەی ئەوانەش دەدەن کە قورئانیان لەلا دەخوێنن و بەشێک نین لەم بەلارێبردنەی کە ئەمڕۆ لە کورستاندا دەگوزەرێت.

❊ ❊ ❊

## چۆن (تدبر)ی قورئان بکەین؟

موسوڵمان بە دەقی ئایەتی قورئان فەرمانی پێکراوە قورئان بە تێگەیشتن و بە (تدبر) بخوێنێتەوە، وەکو الله تعالی فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا﴾[1]. چەندین ئایەتی تریش لە سەر هەمان واتا و مەبەست هەیە.

تدبر واتە: بیرکردنەوەو تێڕامان وباش تێگەیشتن لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بەمەبەستی پەی بردن بە واتا و بە مەبەست و حیکمەتەکانی، ئەگەر موسوڵمان بگاتە ئەو تێگەیشتنە، کە قورئان بە تدبر دەربڕینی لێ کردووە، ئیمانی زیاد دەکات و دەگاتە بڕوای بەهێز و یەقین، چێژو سوودیش لە قورئانی پیرۆز وەردەگرێت.

یەکەم هۆکار بۆ گەیشتن بە (تدبر) ئەوەیە موسوڵمان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی قورئان بێت و خۆی لە قەدەغەکراو وحەرامەکانی بپارێزێت، ئەگینا واتای چی ئەگەیەنێت قورئان بخوێنیت و پێچەوانەی کار بکەیت؟ یان بەبەرنامە و پەیڕەو و فەرمانی غەیری قورئان هەڵسوکەوت و کار بکەیت! بەو شێوە خوێندنەوەی قورئان کاریگەری لەسەر لایەنی روحی و ئیمانی خوێنەرەکەی نابێت و هەر دەبێتە جۆرێک لە ڕاهاتن و خوێندنەوەیەکی ساردوسڕی بێ گیان.

الله تعالی فەرمویەتی: ﴿وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ واتە: پەروەردگار تەقوای کردووەتە هۆکار بۆ فێربوون و بۆ وەرگرتنی زانست، ئێوە تەقواتان

---

[1] - محمد:٢٤

هەبێت، الله تعالی فێرتان دەکات و (تدبر) تان پێ دەبەخشێت! تەقوا پردی تێگەیشتنە لە قورئان!

بە پێچەوانەشەوە واتە بەبێ تەقواو و ڕاوەستان لە سنوورەکانی پەروەردگار، زانستی بەسوود فێر نابن، ئەوە هاوکێشەیەکە لە خودی ئەو قورئانەدا کە دەیخوێنینەوە هاتووە و چەندین ئایەتی تریش هەمان ئەو واتای لێ وەردەگیرێت.

هەروەها بۆ ئەوەی بگەین بە پلەوپایە و ئاستی (تدبر)، پێویستە هەست بە گەورەیی و مەزنیی ئەو قورئانە بکەین کە دەیخوێنینەوە، ئەبێ – وەکو هەندێ لە زانایان فەرموویانە- باوەڕمان وابێت: لەگەڵ قورئاندا زیندووین و بەبێ قورئان مردووین!

لەگەڵ قورئاندا چاوساغ وبیناین و بەبێ قورئان سەرلێشێواو و نابیناین! لەگەڵ قورئاندا لەسەر ڕێگای ڕاستین و بەبێ قورئان گومڕاو وێڵین... دەبێت قورئان بە بەرنامەی ژیانمان بزانین، هەم بە گوفتارمان هەم بە کردارمان ئەوە بسەلمێنین، ئەگینا ئێمە لە کوێ و (تدبر ) و پەی بردن بە واتاکانی لە کوێ.

❊ ❊ ❊

## وا بزانە قورئان ئاراستەی تۆ کراوە

زۆرێک لە زانایان لە کۆن و لە هاوچەرخەکاندا، فەرموویانە بۆ ئەوەی بتوانیت (تدبر) ی قورئان بکەیت و فەرمانەکەی الله لە ئایەتی ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ﴾ و ئایەتەکانی تری هاوشێوەی لە خۆتدا بەرجەستە بکەیت، پێویستە لە کاتی قورئان خوێندندا وا هەست بکەیت ئەم قورئانە بە تایبەت ئاراستەی تۆ کراوە و هەموو فەرمانەکانی و قەدەغەکراوەکانی مەبەست پێیان تۆیت، جا بزانە گوێڕایەڵی ئەبیت یان پشت گوێی ئەخەیت و کەمتەرخەم ئەبیت؟ پێشینانی چاکی ئەم ئوممەتە، مامەڵەو ڕەفتاریان لەگەڵ قورئاندا بەو شێوە دەکرد کە ئایەتەکانی بریتین لە کۆمەڵە پەیامێک لە لایەن پەروەردگارەوە ئاراستەیان کراوە، واتە ئاراستەی خودی خۆیان کراوە! بۆیە بە شەوان دەیانخوێندەوەو لێی ورد دەبوونەوە و بە باشترین شێوە هەوڵی تێگەیشتنیان دەدا، بەڕۆژیش لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بە دوای جێبەجێکردنی واتاکانی، گوێڕایەڵی فەرمانەکانی، خۆبەدوور گرتن لە قەدەغەکراوەکانی بوون. پێشینان خۆشەویستی قورئانیان بە بەڵگەی خۆشەویستی الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ دەزانی، بۆیە دەگێڕنەوە هەندێ لە هاوەڵان فەرموویانە: هەرکێ دەیەوێ الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشیان بوێ، با تەماشای حاڵی خۆی لەگەڵ قورئاندا بکات، گەر قورئانی خۆش دەوێ، ئەوا خۆیشی لەلای الله و پێغەمبەرەکەی ﷺ خۆشەویستە!

❊ ❊ ❊

## لە واتاکانی زیاتر وردبەرەوە

کاتێک قورئان دەخوێنیت، تا پێت دەکرێت بە شێوەیەکی ورد و بە تێرامانەوە بیخوێنەرەوە، بەڵکو هەندێ جار باشتر وایە چەندین جار ئایەتەکە دووبارە بکەیتەوە بۆ ئەوەی باشتر لێی تێبگەیت و واتاکەی لە دڵ و دەروونتدا بچەسپێت! نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت الله تعالى کە ئەم قورئانەی دابەزاندووە بۆ ئەوەیە لێی وردبینەوە و بیر لە ئایەت و واتاکانی بکەینەوە: ﴿كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ﴾.

قورئان زانستی بە سوود و سەرسوڕهێنەری زۆری تێدایە، زانستەکانی نە تەواو دەبن و نەکۆتاییشیان دێت، بەڵکو هەمیشە وەکو ئەوەی نوێ ببێتەوە، بۆ هەموو کات و سەردەمێک ئاسۆی زانستی فراوانتری لێ دەکرێتەوە، بۆیە تا زیاتر بە تێڕامانەوە بیخوێنیتەوەو لە واتاکانی ورد ببینەوە، دەرگاری تێگەیشتنی زیاتر مان بۆ دەکرێتەوە.

بۆ نموونە ئایەتی: ﴿خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ﴾ بە کەمێک تێڕامان و لێوردبوونەوە بیخوێنینەوە دەردەکەوێت، الله تعالى بەم چەند وشە پوخت و کورتە بنەماکانی ڕەوشتی بەرزو جوانی هەمووی بۆ کۆکردینەتەوە!

یان ئەگەر وردبینەوە لە ئایەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ دەبینین بنەمای هەموو فەرمان و قەدەغەکراوەکانی لە خۆگرتووە.

یان ئەگەر بیر لەم ئایەتە بکەینەوە: ﴿فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ * وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾ بۆمان دەردەکەوێت ئاماژەی بۆ هەموو چاکەو

خراپەیەک تێدایە و هاندانیشی بۆ هەموو چاکەیەک تێدایە و و ترساندنی لە هەموو خراپەیەک لە خۆگرتووە.

یان ئەگەر لێکۆڵینەوە لە پیتی سەرەتای سورەتەکان بکەین و بەوردی لە ڕۆشنایی تەفسیرە باش و شایەتی بۆ دراوەکاندا دیراسەی بکەین، دەبینین چەندین زانست و زانیاری سەرسوڕهێنەری تێدایە و بەهەمان شێوە زۆر مەسەلەی تر کە بەڕاهاتن لەگەڵ وردبوونەوەو تێڕاماندا مەزنی کەلامی الله مان بۆ دەردەکەوێت.

ئەگەر بتەوێت پەند و وانە و زانستەکانی ئایەتی ﴿وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ﴾. وەرگریت و فێری بیت، سەرسام دەبیت کە چەند زانستی سەرسوڕهێنەری تێدایە. قورئانیش لەگەل پەلە نەکردن و لێ وردبوونەوەو دووبارە کردنەوەدا هەمووی بەو چەشنەیە.

لە قورئاندا هەموو وشەیەک لە جێگای گونجاوی خۆیدا دانراوە، بە شێوەیەک کە وشە بەکارهاتووەکە گونجاوترینە.

لە قورئاندا کۆتایی ئایەتەکان بە جوانترین شێوە لەگەڵ باس و ناوەڕۆکی ئایەتەکەدا گونجاوە و ڕێک و پێکییان لە نێواندا هەیە.

لە قورئاندا بە ڕاستی و بەبەڵگەی عەقڵ و نەقڵەوە بەسەرهاتی ڕابردوو و هەواڵی داهاتووی تێدایە. ئەمە جگە لە دەیان ئایەت کە زانستی لە ئاسابەرو موعجیزەی زانستی تێدایە کە بەر لە هەزارو چوار سەد ساڵرپێشی زانستی هاوچەرخی داوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ وا هاوەڵانی فێردەکرد،لە کاتی قورئانخوێندندا، لە گەل ئایەتەکاندا بوەستن و سبحان الله بکەن و نزای چاکە بکەن و پەنای لە خراپە پێ بگرن: (إِذَا مَرَّ بِآيَةٍ فِيهَا تَسْبِيحٌ سَبَّحَ وَإِذَا مَرَّ بِسُؤَالٍ سَأَلَ وَإِذَا مَرَّ بِتَعَوُّذٍ تَعَوَّذَ).

پێغەمبەر ﷺ شەوی وا بووە لە ئایەتێکی وەکو ﴿إِنْ تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِنْ تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنْتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ ڕادەوەستا و بیری لە واتاکانی دەکردەوە ودووبارەی دەکردەوە تا ڕۆژ دەبوویەوە.

لە دیاردە خراپەکانی ئەم سەردەمەش کە موسوڵمانان لە هەموو لایەک پێوەی دەناڵێنن و کوردیش بەتایبەتی ئەوەیە، قورئان لە ئەنجامی تێنەگەیشت لە پەیامەکەی لە لایەن موسوڵمانانەوە و بەهۆی چەواشەکاری پلان بۆ داڕێژراو بۆ دوورخستنەوەیان لە بەرنامەکەی، تەنها وەکو کتێبێکی حەڵاڵ و حەرام و سەرچاوەی پیت و بەرەکەت و پاداشت وەرگرتن تەماشا دەکرێت، لە کاتێکدا قورئان بەرنامەیەکی تێروتەسەلی عەقیدەیە و ڕێبازە بۆ ژیان و دەبێت موسوڵمان پەیڕەوی بکات و حوکمی پێ بکات و لە هەموو شتێکدا بۆی بگەڕێتەوە، ئەوەش گەورەترین زیان و لێکەوتەکانی وردنەبوونەوەو پەلەکردنە لە خوێندنەوەیدا!

کاتێک قورئان بەو شێوەی داوامان لێکراوە بیخوێنینەوە، واتە بە (تدبر) و تێگەیشتنی باش لە ئایەتەکانی، کاریگەری باش و خۆشی لەسەر دڵەکانمان دەبێت و ئاسوودەییمان پێ دەبەخشێت و زمانیشمان پاراو دەکات، بەڵام ئەگەر بێ وردبوونەوە و ڕاوەستان لەگەڵ واتاو مەبەست و داواکاری و قەدەغە کراوەکانیدا، هەر پەلە پەلی تەواوکردنیمان بێت و بەبێ کۆشش کردن بۆ بەدەستهێنانی هۆکار و کەرەستەکانی تێگەیشتنی کە ان شاء الله لەم زنجیرەدا هەندێکی دەخەینە ڕوو، ئەوا ناتوانین لە زانستە بەسوود و سەرسوڕهێنەرەکانی، یان لەوەی کە قورئان بەرنامەی ژیانە و ڕێگای سەرفرازی دوا ڕۆژە بەهرەمەند بین.

# پشت بە تەفسیری باش ببەستە بۆ تێگەیشتنی

یەکێک لە هۆکارەکانی تێگەیشتن و (تدبر) ی قورئانی پیرۆز ئەوەیە لە واتاکانی تێبگەیت، بیگومان ئەگەر بیخوێنیت و لێی تێنەگەیت ناشتوانیت فەرمانی (تدبر) لە خۆتدا جێبەجێ بکەیت!

زانا و موفەسسیری قورئان الطبري فەرموویەتی: (إنِّي لأعجب ممَّنْ قرأ القرآن ولم يعلم تأويله، كيف يلتذُّ بقراءته ؟!»[1]. واتە: من سەیرم لە کەسێک دێت قورئان دەخوێنێت و لێی تێناگات چۆن چێژ لە خوێندنەوەکەی وەردەگرێت؟!

هەڵەیەکی گەورش لای خۆمان لە مەسەلەی تەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئاندا هەیە، کە لە جیاتی ئەوەی ئەو مەسەلە گرنگە ببێتە مایەی تێگەیشتن و نزیکبوونبوووەی زیاتر لە ڕوح و جەوهەری قورئان، کەچی بووەتە مایەی دوورکەوتنەوە لە واتا و تەفسیر و پەیامی قورئان! کێشەکەش لەوەدایە کە خراپ لەم فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ تێگەیشتوون: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ القُرآنَ وَعَلَّمَهُ)[2] کورد بە شێوەیەکی گشتی وەکو جۆرێک لەیەکدەنگی! وا تێگەیشتوون ئەم فەرموودەو ئایەت و فەرموودەکانی تری هاوشێوەی، تەنها واتای گرنگی و بایەخدان بە تەجوید دەگرێتەوە!

لە کاتێکدا مەبەستی یەکەم لەو فەرموودەیە تیگەیشتی پەیام و بەرنامە و واتاو ئەحکامی قورئانە نەک تەجوید و جوان خوێندنەوە و مەخارجی پیتەکان، (ابن تيمية) بە ڕەحمەت بێت دەفەرموێت: تێگەیشتنی واتاو

---

[1] - معجم الأدباء، (٥/ ٢٥٦).

[2] - رواه البخاري .

مەعناکانی قورئان لە پێشترە لە فێربوونی چۆنێتی دەربڕینی پیتەکانی، چونکە موسوڵمان بە تێگەیشتنی واتاکانی ئیمانی زیاد دەکات نەک بە فێربوونی تەجوید و جوان خوێندنەوەی پیتەکانی.[1]

بێگومان ئەمەش بە واتای ئەوە نایەت کە بایەخ بە تەجویدی قورئان نەدەین نەخێر، بەڵکو مەبەست لە تێکدانی ئەولەویەت و دوورکەوتنەوەیە لە مەبەستە گەورەکە کە تێگەیشتن و (تدبر) قورئانە، کە بەداخەوە کە سالآنێکە خەریکە تەجوید ئەو ڕۆڵە دەبینێت لە کوردستاندا، مامۆستایەکی زۆری کورد ژیانی خۆیان و فێرخوازێکی زۆر لەگەڵ خۆیاندا بە ئەحکامی تەجوید و مەخاریجی پیتەکان و قیرائاتی قورئانی بەسەر دەبەن، لە ئەحکامی حروف ی قورئان شارەزان بەڵام لە ئەحکام و حدود ی قورئان بێ ئاگان، لە گەڵ پیتەکانی قورئان و چۆنێتی خویندنەوەی مامەڵە دەکەن بەڵام لەگەڵ لایەنی ئیمانی و عەقیدەو پەروەردەیی مامەلە ناکەن زۆر بەکەمی نەبێت، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە و ڕێگرێکە لەبەردەم تێگەیشتن و (تدبر) قورئاندا.

ئەوانەی کە توانای گەڕانەوەیان بۆ سەرچاوەکان هەیە واجبە لەسەریان هیچ نەبێت بە ئەندازەیەکی کەم و سنووردار و ئەوەندی کە تێگەیشتنی واتاکانی قورئانیان بۆ دەستەبەر بکات، بگەڕێنەوە بۆ تەفسیر و ئەو کتێبانەی کە باس لە بەرنامەو عەقیدە و لایەنی ئیمانی قورئانی پیرۆز دەکات لە قسەی زانایاندا، وەکو یارمەتیدەری سەرەتاییش لەم بارەوە بۆ (تدبر) باشترە:

---

[1] - مجموع الفتاوى، (١٣/ ٤٠٣)

١ - بەلای کەمەوە کتێبێکی تایبەت بە تەفسیری وشەکانی قورئانت هەبێت، کتێب لەو بارەوە زۆرن، من لێرەدا کتێبێکی بەسوود و ئاسان و بەردەست لە ئێنتەرنێت پێشنیار دەکەم کە بەشێوەیەکی سەرەتایی و ئاسان واتای وشەکانی قورئانت پێ ئەدات ئەویش کتێبی (وجه النهار الكاشف عن معاني كلام الواحد القهار) عبدالعزيز الحربي، بێگومان کتێبی تریش زۆرن وەکو: (مفردات القرآن) للراغب الأصفهاني. شارەزایی تەفسیرە کوردییەکانم نییە و نەمخوێندوونەتەوە، بۆیە ناتوانم ئاماژە بۆ هیچ تەفسیرێکی کوردی بکەم، تەنانەت وەرگێڕاوەکانیش چونکە نازانم چۆنیان وەرگێڕاوە، وەکو خۆێشم چەند ساڵیکە نزیکەی بیست جوزئی قورئانم لە ڕووی ڕوونکردنەوەی وشەکانی بە کوردی و بە کورتی تەفسیر کردووە بەڵام بە هیوای ئەوەی بتوانم تەواوی بکەم هێشتا چاپم نەکردووە.

٢ - دوای ئەوەی واتای وشەکانی قورئانت زانی کتێبێکی پوخت و زانستی وەکو: (التفسير الميسر) بخوێنەرەوەو با هەمیشە نزیکت بێت بۆ ڕاڤەو تەفسیری ئایەتەکان، ئەم تەفسیرە لەیەک بەرگدایەو زۆر بە سوودە، هەروەها تەفسیرێکی تری پوخت هەیە بەناوی (المختصر في تفسير القرآن الكريم) ئەویش پوخت و بە سوودە ئەوەندەی من لێیم خوێندووەتەوە و لێی تێگەیشتووم، لە دوای ئەوەش ئەتوانیت بچیتە سەر تەفسیرەکانی الطبري و ابن كثير و البغوي بە گوێرەی ئاست و توانای زانستی خۆت و هەموو تەفسیرانەو تەفسیرەکانی تریش پێویستە وریای ئەو هەڵانە بیت کە نووسەرەکانیان لێیان تێپەڕبووە بۆ نموونە وەکو مەسەلەی ئیسرائیلیات لە تەفسیری (ابن كثير) دا.

دەشکرێت سوود لە هەندێ کتێبی تایبەت بە ئاسانکردنی تیگەیشتن و (تدبر) لە قورئاندا ببینێت وەکو: (قواعد التدبر الأمثل لكتاب الله عزوجل) عبدالرحمن حبنكة الميداني، (تعليم تدبر القرآن الكريم) هاشم علي الأهدل.

## لە کۆتاییدا:

لە مەسەلەی تێگەیشتن و (تدبر) ی قورئاندا، بەردەوام قورئان خوێندن بەبێ هەبوونی کەرەستەکانی تێگەیشتنی سوودی باش و چاوەڕوانکراوی نابێت، من باسم لە ئەجرو پاداشتەکەی نییە ئەوەیان لەسەر نیەت و عەقیدەی خوێنەرەکەی دەمێنیتەوە، ئەگەر خوێنەرەکە عەقیدەی قورئانی پیرۆزی لە خۆیدا بەرجەستە کردبێت و لە سنوورەکانیدا ڕابوەستێت، با تێیشنەگات لە واتاکانی، الله تعالى هەر پاداشتی بۆ دەنووسێت ان شاء الله! بەڵام وەکو زانایەک دەڵێت: ئەو کەسەی قورئان بخوێنێت و لێی تێنەگات، وەکو کەسێکە لە تاریکیدا بێت و نامەیەکی زۆر گرنگی لە کەسێکی زۆر مەزنەوە بۆ هاتبێت و لەو تاریکیەدا چرایەکی پێ نەبێت بتوانێت نامەکەی بخوێنیتەوە بزانێت چی تیێدایە!

❊ ❊ ❊

## شارەزا بوون لە زمانی عەرەبی بنەمای (تدبر)ە

الله تعالی قورئانی پیرۆزی بە زمانی عەرەبی کە دەوڵەمەندترین و پاراوترین زمانەکانی سەرزەوییە دابەزاندووەو فەرموویەتی: ﴿إِنَّا جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾[1] بۆیە هەرکێ ئەگەر زمانی عەرەبی نەزانێت نەک لە (تدبر) و تێگەیشتنی قووڵ و ورد بێ بەش دەبێت، بەڵکو هەرناتوانێت لە ڕواڵەت و مەبەستی گشتیشی تێ بگات، بە کورتی زانینی زمانی عەرەبی کلیلی تێگەیشتنی قورئان و سوننەت و شەریعەتی ئیسلامە بە شێوەیەکی گشتی.

لە ڕاستیدا شارەزا نەبوون لە زمانی عەرەبی دیوار و پەرژینێکە لە نێوان موسوڵمان و تێگەیشتنی قورئان و سوننەتدا کە ئەوانە سەرچاوەی زوڵاڵی تێگەیشتنی ئیسلامن، هەربۆیە نەیارانی ئیسلام هەر زوو دەرکیان بەم ڕاستییە کرد و بە جۆرەها شێواز و ڕێگە دژایەتی زمانی عەرەبیان کرد و سەرەتا لە میسرو دواتر لە وڵاتانی تر هەوڵی دوورخستنەوەی خەڵکیاندا لە زمانی عەرەبی، لە ڕێگەی زۆر بیانووی دروستکراوەوە، توانییان خەڵکی لە زمانی عەرەبی دوور بخەنەوە بەوەش ئامانجەکەیان پێکا و ئەوانیان لە بنەماکانی عەقیدەو شەریعەتی ئیسلام دوور خستنەوە، تەنانەت دەسەڵاتەکانی وڵاتە عەرەبییەکانیش کە پاشکۆ و ئەڵقە لەگوێی ڕۆژئاوای مەسیحی و جولەکەن، لە ڕێگەی بایەخدانی زۆر بە زمانی ئینگلیزی و زمانە بیانییەکانی تر لەسەر حیسابی زمانی عەرەبی و ڕەنگدانەوەی ئەو بابەتە لە

---

[1] - الزخرف:٣،

پرۆگرامی خوێندنی هەموو قۆناغەکاندا، توانیان مەودایەکی گەورە لە نێوان قورئان و لە نێوان گەلاندا درووست بکەن و ئێستەش بە هۆی ئەو دابڕانەوە لاوازترین پەیوەندی لە نێوان موسوڵمانان و قورئاندا درووست بووە کە لە درێژایی مێژوودا حاڵەتی هاوشیوە ڕووی نەداوە! سەیریش ئەوەیە خەڵکەکە قورئان دەخوێنن، بەڵام بێ ئەوەی لێی تێبگەن و بزانن داوای چییان دەکات و بەرنامەو پەیامەکەی بۆ مرۆڤایەتی چییە.

دەسەڵاتەکان بۆ ئەم مەبەستە و لە هەموو وڵاتەکاندا گەورەترین هۆکاری سەرکەوتنیان لەم پیلانەیاندا پشت بەستنیان بوو بە سوپایەکی لەبن نەهاتوو لەوانەی بەناو دینەوە قسەدەکەن و مزگەوتەکانیان بەدەستەوەیە و خۆیشیان لە ڕاستیدا پیاوی دەسەڵاتن و لە پێناو پارەیەکی کەمدا دینی خۆیان دەفرۆشن و بەئارەزووی نەیارانی ئیسلام فەتوا دەدەن و قسە بۆ خەلکی دەکەن و دەرەنجامیش سەر لە موسوڵمانان تێکدەدەن.

سەبارەت بە بارودۆخی لای خۆیشمان، سەرباری بەوەی کە ئێمەش هەمان کێشەمان هەیە و بەداخەوە مەلایەکی زۆر هەن نەخۆیان لە ئیسلام تێگەیشتوون و بەردەوامیش سەرلە موسوڵمانان دەشێوێنن و ئیسلامێکی جیاوز لە ئیسلامی کیتاب و سوننەتیان پێشکەش دەکەن، ئاستەنگێکی گەورەی تریشمان بۆ زیاد بوو، ئەویش لاوازی کەسایەتی حیزبە ئیسلامییەکانی کوردستان بوو بەرانبەر بە عەلمانییەکان و بە ئێستاشەوە لە مەسەلەی کوردایەتیدا کە بە واتای دژایەتی و هیچ نەبێت پشتگوی خستنی زمانی عەرەبی دێت، ئەوان کێبڕکێیان لەگەڵدا دەکەن و بەزمانی حاڵ پێیان

دەڵێن ئێمەش لەمەڕ پەراوێزخستنی زمانی عەرەبی هەمان هەلوێستی ئێوەمان هەیە و بەمەش بوونە هۆکارێکی یارمەتیدان بۆ پرۆسەی نامۆکردنی زمانی عەرەبی کە یەکسانە بە نامۆکردنی ئیسلام، بەدەر لەوەی ئەوان دەرک بەو ڕاستیە بکەن یان نەیکەن، بەڵام لە بەروبومەکانی ئەو پرۆسەی باسمان کرد ئەمڕۆ نەوەیەک سەریان هەڵداوە هیچ لە زمانی عەرەبی نازانن و دواجار لە قورئان و لە سوننەتیشەوە دوورن، تاکە ڕێگەی دیندارەکانیش بۆ فێربوونی زانستەکانی ئیسلام ئەوەیە کتێبی وەرگێڕدراو بخوێننەوە، کە ئەویش بۆ خۆی لەناو کورددا یەک دنیا قسەو تێبینی هەلدەگرێت. هەر بۆیە لە دێر زەمانەوە زانایان فێربوونی زمانی عەرەبییان بە واجب زانیوەو خزمەت کردنیان بە خزمەت کردنی قورئان بینیوە و بەرگریکردنیشیان لەو زمانە بە نیشانەی غیرەت و دڵسۆزی لەسەر ئیسلام ئەژمار کردووە.

زیانی فێرنەبوونی زمانی عەرەبی وەکو زیانی فێرنەبوونی هیچ زمانێکی تر نییە! چونکە تێنەگەیشتن لەو زمانەدەبێتە مایەی لادان لە حوکم و سنوورەکانی قورئان و سەرهەڵدانی تێگەیشتنی نامۆ و هەڵە بۆ قورئان گرنگی زمانی عەرەبی لەوەدایە کە ئامرازی تێگەیشتنی قورئان و سوننەت و عەقیدەو شەریعەتی ئیسلامە.

لە کۆتاییدا و بە کورتی دەڵێم: زمانی عەرەبی ڕێگەی تێگەیشتن و (تدبر) ی قورئان و سوننەتە، شارەزایی لەو زمانە وەکو هەبوونی بینایی و چاوساغییە، نەشارەزاییش لێی وەکو نابینایی وکلۆڵییە!

بەداخەوە دەشبێتە مایەی دوورکەوتنەوە لە ڕوح و جەوهەری ئیسلام، لەڕووی ناچاریشەوە نەبێت تەرجەمە و وەرگێڕانی دەقە دینی و زانستە ئیسلامییەکان بۆ زمانی کوردی نابێتە قەرەبووی نەزانینی ئەو زمانە، ئینجا جگە لەوەی کە دین بە شێوەیەکی گشتی لەسەر شارەزابوونی ئەو زمانە وەستاوە، هاوکات سەرچاوەیەکی سەردەمیانەی دەوڵەمەندیشە بۆ زۆربەی زانستەکانی تر و لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ڕێگایەکە بۆ سەربەرزی دونیا و دوارۆژ، بەڵام بەهۆی ئەوەی ناحەزانی ئیسلام دەزانن شارەزابوونی خەڵکی لە زمانی عەرەبی ڕێگەی شارەزابوونیانە لە دینەکەیان، بۆیە هەموو ڕێگەو هۆکارێک دەگرنە بەر بۆ دورخستنەوەیان لە فێربوونی و ناشیرین کردن ونامۆکردنی ئەو زمانە.

❊ ❊ ❊

## چەند ڕێگەیەك بۆ باش تێگەیشتنی قورئان

لێرەدا و لە ڕۆشنایی قسەی شارەزایاندا لەوانەی لەم بوارەدا وردبوونەتەوە، چەند ڕێگەیەکی تر بۆ تێگەیشتنی باش و لێوردبوونەوەی قورئانی پیرۆز دەخەینە ڕوو، لەوانە:

- لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا هەوڵ بدەیت ئایەتەکان ببەستیتە ئەو واقیع و ژیانەی خۆت و دەوروبەرت و ئەوە بکەیتە هۆکارێک بۆ چاکسازی خۆت و بازنە نزیک و دوورەکانی دەوروبەرت، گرنگە بتوانیت قورئان بکەیتە تەرازوویەک بۆ زانینی حەقیقەتی هەموو شتێک کە لەم ژیانەدا دەیبینیت و بەسەرتدا دێت،

- هۆکارێکی تری (تدبر) و وردبوونەوە لە قورئانی پیرۆز ئەوەیە هەمیشە هەوڵ بدەیت ئایەتەکان پێکەوە ببەستیت، واتە تەماشای پێش و پاشی ئایەتەکە بکەیت، بۆ نموونە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ* كَبُرَ مَقْتاً عِنْدَ اللَّهِ أَنْ تَقُولُوا مَا لَا تَفْعَلُونَ﴾ زانایان ئەوەیان بە (مناسبات السور) ناوبردووە و بە کارێکی باش و پێویستیان زانیوە بۆ جوان تێگەیشتنی قورئان.

- وە بیریش لەوە بکەیتەوە دەبێ بۆچی ئەم سورەتە بەمە دەستی پێکردووە و بەوە تەواو بووە، ئەبێ حیکمەتێکی تێدا بێت، بۆچی ئەم وشەی تێدا بەکار هات نەک وشەیەکی تر، چی بکەم بۆ ئەوەی واتای ئەو ئایەتە لە خۆمدا جێبەجێ بکەم.

- هەمیشە بتوانین بەراوردی حاڵی خۆمان بکەین لەگەڵ قورئاندا! کە باسی سیفەتی ئیمانداران دەکرێت بیربکەمەوە ئایا من ئەو سیفەتانەم لە خۆمدا بەرجەستە کردووە؟ بۆ نموونە:کە ئەم ئایەتە ئەخوێنیتەوە: ﴿كَانُوا قَلِيلاً مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ. وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ. وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾

ئایا عیبادەت و شەونوێژ و بەخشینم هەیە؟

یان کاتێک ئەو ئایەتانەی باسی تاوانباران و بێ باوەڕان دەکات بیربکەمەوە ئایا خۆمم لە ئاکار و خەسڵەتەکانیان بەدوور گرتووە؟

- یان کە الله تعالى فەرمویەتی: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ﴾ ئایا لەسەر ئاستی خۆت و ماڵ و مناڵت حوکم بە قورئان دەکەیت؟ ئایا پێت خۆشە حوکم بە قورئان بکرێت و قورئان لە هەموو دونیادا باڵا دەست بێت؟ یان پێت خۆشە قورئان تەنها بەم شێوە بۆ خوێندنەوە بێت و لە واقیعی ژیانی خەڵکیدا حوکم نەکات. بە کورتی گرنگە لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئاندا وێستگەیەکت هەبێت و پرسیار لە خۆت بکەیت و خۆت نمایش بکەیتە سەر واتاکانیدا!

- ئەگەر بمانەوێت توانای (تدبر) و تێگەیشتنی قورئانمان هەبێت پێویستە قورئانمان خۆش بوێت و حەز بکەین ژیانمان ڕەنگ و ئاکار و حوکم و بیروباوەڕی قورئان وەرگرێت، نەک وەکو ئێستە کە قورئان بووەتە هێمایەک بۆ پیرۆزی و خۆشەویستنی بێ بەڵگە و بۆ سوێندخواردن و هەڵواسین و ناوێکی بێ ناوەڕۆک! مرۆڤ کە شتێک یان کەسێکی خۆش بوێت ئیتر دڵی پێوەی دەبەستێتەوە و حەز دەکا هەمیشە لەگەڵی بێ، ئایا ئێمە لەگەڵ قورئاندا ئەو خۆشەویستیەمان هەیە؟

بۆیە ئەو خۆشەویستییە درووست نەبێ تێگەیشتنیش دروست نابێ، بێگومان لەدوای تیگەیشتن خۆشەویستیش زیاد دەکات.

- یەکێکی تر لە هۆکارەکانی (تدبر) و تێگەیشتنی قورئان ئەوەیە بەدەنگی بەرز و خۆش بیخوێنینەوە، نەک بە دەنگێکی نزم وەکو چپە،یان وەکو خوێندنەوەی هەر بابەت و کتێبێکی ئاسایی تر.

بەڵکو بەگوێرەی توانامان پێویستە بە تەرتیل و بە جوان خوێندنەوەی پیت و مەخاریجەکان بیخوێنینەوە.

- رەچاوکردنی ئەوەی کە لە زانستی تەجویددا بە (الوقف و الإبتداء) باس کراوە، مەسەلەیەکی گرنگە و یارمەتیدەرە بۆ تێگیەشتنی قورئانی پیرۆز، لە ڕاستیدا شارەزابوون لەوەی لە کوێوە دەست بە خوێندنەوە بکەیت و لە کوێ بوەستیت، مەسەلەیەکی زۆر گرنگە و کاریگەری باشی لەسەر تێگەیشتنی خوێنەر هەیە و زانایانی لەسەردەمی سەلەف تاکو ئێستا هەمیشە جەختی لەسەر دەکەنەوە، وەکو ابن عمر رضـي الله عنه فەرموویەتی: (لقد عشنا برهة من الدهر وإنّ أحدنا ليؤتى الإيمان قبل القرآن،وتنزل السورة على محمد ﷺ فنتعلم حلالها وحرامها وما ينبغي أن يوقف عنده منها..). بۆ نموونە هەندێ دەست پێکردن هەیە واتای ئایەتەکە تەواو تێکدەدات، وەکو دەستپێکردن لە ﴿إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ﴾ لە ئایەتی: ﴿لَقَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَاءُ﴾

❊ ❊ ❊

## دوو تێبینی گرنگ دەربارەی تەکبیراتی ناو نوێژ

تەکبیراتی ناو نوێژ دەکرێت لە زۆر ڕووەوە باس بکرێت، بەڵام لێرەدا بە کورتی و لە ڕۆشنایی قسەی زانایانەوە دوو تێبینی دەربارەی باس دەکەم:

**یەکەم:** دەست بەرز کردنەوە بە شێوەیەکی گشتی لەناو نوێژدا لە چوار جێگەدا هەیە:

١- لە کاتی دەست پێکردنی نوێژدا (تکبيرة الإحرام).

٢- لە کاتی چوون بۆ ڕکوع.

٣- لە کاتی هەڵسانەوە لە ڕکوع.

٤- لە کاتی هەڵسانەوە بۆ ڕکاتی سێیەم لەو نوێژانەی کە لە دوو ڕکات زیاترن، دەست بەرزکردنەوەکەش لەم حاڵەتەدا لە کاتی ڕاوەستاندا دەبێت نەک یەکسەر لەو کاتەی کە لە التشهد ی یەکەم هەڵدەسیتەوە هەر بەدانیشتنەوە دەست بەرز بکەیتەوە .

**دووەم:** پێویستە تەکبیرەکان لە درێژایی ماوەی نێوان دوو کرداری نوێژەکەدا بن! بۆ نموونە: کە لە ڕاوەستانەوە دەچیت بۆ ڕکوع و دەڵێیت الله اکبر بەردەوام دەبێت لە وتنی تەکبیرەکە تا کاتی ڕکوع! نەک بڵێی الله اکبر و تۆ هێشتا ڕاوەستاویت! یان بگەیتە رکوع و ئینجا بڵێیت الله اکبر و ئیتر بەو شێوە.

❊ ❊ ❊

## تێبینییەکی گرنگ دەربارەی سورەتی (الفاتحة)

زانایان زۆر گرنگییان داوەتە جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و وردبوونەتەوە لە هەموو وردەکارییەکانی تەجوید تێیدا، بۆ نموونە سورەتی (الفاتحة) فەرموویانە چواردە شەددەی تێدایە (شەددە واتە دوو پیتی هاوشێوە یەکەمیان ساکینە و دووەمیان جوڵاوە وەکو رب) پێویستە خوێنەر لە کاتی نوێژەکانیدا هەموویان دەرببڕێت ، وەکو شەددە لە وشەکانی: (الله، الرّحمن، الرّحيم، ربّ، إيّاك، الصّراط، الضّالين) لە لای زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە – کەمێک مەزهەبی حەنەفییەکان نەبێت نەرمییان دەربڕیوە – هەموویان وتوویانە ئەگەر نوێژخوێن یەک شەددەی نەخوێندەوە و دەشیتوانی بیخوێنێتەوە پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە ، ئەمەش بە کورتی هەندێکە لە وتەی زانایان لەو بارەوە:

سەبارەت بە ڕێڕەوەی (الأحناف): قال في البناية: وعند عامة مشايخنا لو ترك التشديد من إياك، ومن رب العالمين يعيد، والمختار أنه لا يعيد صلاته.. واتە: بەلای زۆربەی زانایانمانەوە ئەگەر نوێژخوێن شەددەیەکی لە سورەتی الفاتحة نەخوێندنەوە پێویستە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە، بەڵام بۆچوونی پەسەند ئەوەیە دووبارەی ناکاتەوە .

سەبارەت بە ڕێڕەوەی مالکییەکان: (الدسوقي) دەڵێت: (وحاصل المسألة أن اللاحن إن كان عامدا، بطلت صلاته، وصلاة من خلفه، باتفاق؛ وإن كان ساهيا، صحت باتفاق؛ وإن كان عاجزا طبعا لا يقبل التعليم فكذلك، لأنه ألكن، وإن كان جاهلا يقبل التعليم فهو محل الخلاف سواء أمكنه التعلم أم لا، وسواء أمكنه

الاقتداء بمن لا يلحن أم لا، ولا فرق بين اللحن الجلي والخفي في جميع ما تقدم. قاله أبو علي المسناوي.)

**پوختەی قسەکەی ئەوەیە ئەگەر نوێژخوێن یان پێشنوێژ بەئەنقەست شەددەیەک نەخوێنیتەوە نوێژەکەی پێ بەتاڵ ئەبێتەوە.**

**سەبارەت بە ڕێڕەوی شافعییەکان (المرداوي الشافعي) لە کتێبی الحاوي فەرموویەتی:** (فأما تشديد آيات الفاتحة في الصلاة فهي أربع عشرة تشديدة، فإن ترك التشديد لم يجز، لأن الحروف المشددة تقوم مقام حرفين، فإذا ترك التشديد صار كأنه قد ترك حرفا، فلذلك لم يجز).

**پوختەی ئەم وتەیەش بەهەمان شێوە ئەوەیە شەددە واتە دوو پیتی هاوشێوە جا ئەگەر تەشدیدی نەکات واتە پیتێکی لە قورئانی پیرۆز نەخوێندووەتەوە ئەوەش کارێکی نادرووستە ئەگەر نوێژخوێن یان پێشنوێژ یەکێک لەو چواردە شەددەی سورەتی الفاتحة نەخوێنێتەوە بە ئەنقەست و لەگەڵ تواناادا نوێژەکەی بەتاڵ ئەبێتەوە.**

**سەبارەت بە حەنبەلییەکان (ابن قدامة) لە کتێبی (المغني)دا فەرموویەتی:** (فصل: يلزمه أن يأتي بقراءة الفاتحة مرتبة مشددة، غير ملحون فيها لحنا يحيل المعنى، فإن ترك ترتيبها، أو شدة منها، أو لحن لحنا يحيل المعنى، مثل أن يكسر كاف (إياك)، أو يضم تاء (أنعمت)، أو يفتح ألف الوصل في (اهدنا)، لم يعتد بقراءته، إلا أن يكون عاجزا عن غير هذا. ذكر القاضي نحو هذا في (المجرد)، وهو مذهب الشافعي) **واتە پێویستە نوێژخوێن سورەتی الفاتحة بە ڕێکوپێکی بەبێ هەڵەیەک کە واتای ئایەتەکە بگۆڕێت بخوێنێتەوە جا گەر شەددەیەکی**

نەخوێندەوە یان حەرەکەی پیتێکی گۆڕی ئەوە حیساب بۆ خوێندەوەکەی ناکرێ مەگەر توانای نەبێ و نەتوانێ بەتەواوی بیخوێنێتەوە پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت هەموویان بەتاڵبوونەوەی نوێژیان بەستووەتە ئەوەی توانای هەبێ و نەیکا یان بتوانێ خۆی فێربکا و نەیکا، گەر نا ئەو کەسەی کە نەخوێندەوارە یان زمانی توانای گۆکردنی وشەکەی بەباشی نییە: ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾ ئەمە سەبارەت بە شەددەکانی، سەبارەت گۆڕینی پیتێک بە پیتێکی تر بۆ نموونە (ض) بکرێتە (ظ) لە (ولا الضالين) واتە: بکرێتە ولا الظالين، یان گۆڕینی سەرو بۆرەکانی بۆ پێشنوێژ یان بۆ کەسێک بتوانێت فێربێت و خۆی فێر نەکات. بۆچوونیان توندتر بووە لەو بارەوە ، بۆیە گرنگیدان بە جوان خوێندنەوەی قورئان بە تایبەت سورەتی (الفاتحة) لە ناو نوێژەکاندا زۆر کارێکی گرنگ و پێویستە لەسەر موسڵمان و واجبە لەسەری خۆی فێر بکا.

❊ ❊ ❊

## زنجیرەی جوان خوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة)

**(الإستعاذة)** بێگومان سورەتی فاتیحە یەکێکە لە مەزنترین سورەتەکانی قورئانی پیرۆز، هەموو موسوڵمانێک ڕۆژانە تەنها لە نوێژە فەرزەکاندا حەڤدە جار دەیخوێنێتەوە، جگە لە نوێژە سوننەتەکان و لە حاڵەتی تردا، بۆیە زۆر گرنگە هەموو موسوڵمانێک بە جوانی و بە پێی بنەماکانی جوانخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بیخوێنێتەوە، هەوڵ ئەدەم هەر جارێک باس لە حوکمەکانی یەک ئایەت لە ئایەتەکانی ئەو سورەتە مەزنە بکەم، ئەگەریش ئێوەی بەڕێز بە پێویستتان زانی ئەوا هەمان ئەم بابەتانە بۆ تۆماری دەنگیش- ان شاء الله - بڵاودەکەمەوە.

جا سەرەتا با لە (الاستعاذة) دەست پێ بکەین و بە پشتیوانی الله دەڵێین:

(الاستعاذة) واتە: وتنی ﴿اعوذ بالله من الشيطان الرجيم﴾، ئەم شێوازە شیوازی هەڵبژاردەیە لە لای زانایان چونکە چەندین شێوازی تری هەیە موسوڵمان دەتوانێت بەکاری بهێنێت، وەکو: ﴿اعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم﴾ و شێوازی تر. واتاکەی بریتیە لە: پەنا دەگرمە پەروەردگارم لە شەیتانی دەرکراو لە ڕەحمەتی الله ، وتنی واجب نییە و موستەحەببە لە سەر بۆچوونی پەسەند.

لە کاتی دەربڕینی (الاستعاذة) پێویستە خوێنەر وریای ئەم چەند خاڵەی خوارەوە بێت:

١- هەمزەی وشەی (اعوذ) گەورە نەکاتەوە و سیفەتی (استفال) ی نەگۆڕێت بۆ (استعلا)ء.

٢- وریا بێت هەمزەو پیتی (ع) لە وشەی (اعوذ) تێکەڵ نەکات و ببێتە (ععوذ)..

٣- پیتی (واو) لە (اعوذ) پیتێکی مەددیە واتە: پێویستە دوو جووڵەی پێبدەیت ، یان وەکو زانایان فەرموویانە ئەوەندەی ئەلیفێکی مەددی درێژی بکەیتەوە .

٤- پێویستە خوێنەر وریای ئەوەبێت پیتی (ذ) لە هەمان وشە نەگۆڕێت بۆ پیتی (ز) چونکە دەبێتە (اعوز) یان جاری وا هەیە دەکرێتە (اعوظ) ئەوەش هەڵەی جەلی پێ دەوترێت و حەرامە .

٥- لەسەرەتای وشەی دووەم (بالله) خوێنەر پێویستە وریای اختلاس نەکردنی کەسرەی بائەکە بێت و بە جوانی دەری بخات بێ ئەوەی بیکاتە پیتی (ي).

٦- لە پیتی لام لە وشەی مەزنی (بالله) وریای هەڵەیەک ببێت کە زانایان بە (مط) ناویان بردووە واتە درێژکردنەوە یان کێش هێنانەوە نابێت لەسەر ئەو لامە زۆر بوەستی.

٧- لە دەربڕینی پیتی (ه) لە هەمان وشە دیسان وریای اختلاس نەکردن ئەبیت و پێویستە کەسرەکە بە جوانی دەربڕیت.

٨- لە پیتی (ن) ی (من) یەکسەر دەچیتە سەر خوێندنەوەی وشەی (الشیطان) واتە بەم شێوەیە: (منشیطان) چونکە هەمزەکە هەمزەی وەصڵەو ناخوێندرێتەوە .

٩- پیتی (ش) لە وشەی (الشیطان) نابێت قەڵەو بکرێتەوە بە هۆی پیتی (ط) کە پیتێکی بەرزە .

١٠- پیتی (ط) پیتێکی بەرزە (مستعلي)ە وریا ئەبین وەکو (ت) نەیخوێنینەوە چونکە دەبێتە (الشیتان) ئەوەش جائیز نییە و حەرامە.

١١- پیتی ئەلیفی دوای پیتی (ط) لە وشەی (الشیطان) مەددێکی طبيعي یە و نابێت نە لە دوو جووڵە درێژتر نەبێت نە کورتتر.

هەروەها پیتی (ش) شەددەدارە و سیفەتی (التفشي) تێدایەوە پێویستە بە جوانی دەریببڕین و کەمێک لەسەری بوەستین: (الششیطان).

١٢-کۆتا پیتیش لە (الاستعاذه) پێویستە بە شیوەیەک بخوێنرێتەوە مینگەکەی بیستراو بێت ئەگینا گوێگر بەم شێوە دەیبیسێت: الشیطا.

١٣- هەروەها لە کاتی پێکگەیاندنی هەردوو وشەی (الشیطان) و (الرجیم)، بەم شێوە دەخوێنرێتەوە: (الشیطانرجیم) وەکو ئەوەی یەک وشە بێت، لەوەش وریای دەربڕینی کەسرەی نوونەکەو شەددەی ڕائەکە ئەبین بە جوانی دەریببڕین.

ئەمەو برگەی ﴿اعوذ بالله من الشیطان الرجیم﴾ بەشێک نییە لەسورەتی فاتیحە نییە، بەڵام لەبەر ئەوەی لەسەرەتای هەموو سوڕەتەکانی قورئانەوە سووننەتە بخوێنرێت بۆیە باسم کرد .

❊ ❊ ❊

## (البسملة)

وشەی البسملە لە ڕێزمانی عەرەبیدا (نحت)ی پێدەوترێت، واتە: داتاشینی وشەیەک بۆ ئاماژە کردن بۆ چەند وشەیەک ، لێرەشدا بە واتای ﴿بسم الله الرحمن الرحيم دێت﴾، کە یەکەم ئایەتی سوڕەتی فاتیحەیە، هەندێ جیاوازیش لەو بارەوە هەیە کە ئایا ئایەتێکە لەو سورەتە یان نا، بەڵام هەموو پێشەوایانی قیرائات یەکدەنگن لەسەر ئەوەی پێویستە لە سەرەتای هەموو سوورەتەکانی قورئان بخوێنرێت، جگە لە سورەتی (براءة) نەبێت، وەکو پێشەوا الشاطبي فەرموویەتی:

ومهما تصلها أو بدأت براءة *** لتنزيلها بالسيف لست مبسملاً

ولابد منها في ابتدائك سورة *** سواها وفي الأجزاء خُيِّـر من تلا

هەروەها گومان نییە لەوەیش کە ئایەتێکە لە سورەتی (النمل)...

لەوشەی (بسم) پێویستە ڕەچاوی دەربڕینی کەسرەی بائەکە بکەین و، اختلاس نەکرێت، هاوکات درێژیش نەکرێتەوە وەکو پیتی (ي) چونکە هەموو کەسرەیەک درێژبکرێتەوە دەبێتە (ي) و هەموو یائێکیش کورت بکرێتەوە دەبێتە کەسرە .

ئینجا پێویستە سیفەتی (الصفير) لە پیتی سین دەربڕین و دەنگێکی تیژە هەندێ لە زانایان فەرموویانە دەنگێکە وەکو دەنگی کوللە وایە .

١- (الله) وشەی مەزنی الله بە ناسکی دەریدەبڕین لەبەر ئەوەی پیتی پێش خۆی کەسرەی هەیە ئەمەش بنەمایەکی نەگۆڕە وشەی الله ئەگەر پێش خۆی کەسرە بێت پێویستە بە ترقيق بخوێنریتەوە نەک بە تفخيم.

وشەی (الله) کە دەیگەیەنینە وشەی (الرحمن) وەکو ئەوەی یەک وشە بن دەیانخوێنینەوە بەم شێوە: ( ..اللهرحمن ) چونکە ئەلیف و لامی الرحمن شەمسیەو ناخوێنرێتەوە..ئینجا وریای نەخوێندنەوەی پیتی (ە) دەبین لە وشەی مەزنی (الله) زۆر لە خوێنەران ئەو هائە هەر ناخوێننەوە ، ، یان بە پیتی یا دەیخوێننەوە ،وەکو ئەوەی بڵێن: (بسم لای رحمن..)، بۆیە خوێنەر زۆر پێویستە ئەو هائە دەربڕێت و نەیکاتە پیتی یا یان هەر پیتێکی تر.

وشەی الله مەددێکی طبیعي تێدایە نابێت لە دوو جووڵە درێژتربکرێتەوە ، بەڵام ئەگەر لەسەری وەستاین ئەوکاتە دەتوانین بە ٢ یان بە ٤ یان ٦ جووڵە لەسەری بوەستین.هەروەها خوێنەران هەڵەیەکی تری تێدا دەکەن ئەویش ئەوەیە (مط) ی لامەکەی دەکەن واتە زیاد لەسەر دەوەستن و کێشی پیتەکە دەهێننەوە.

٢- (الرحمن): ئەلیف و لامەکەی سەرەتا شەمسیەو تێهەڵکێش دەکرێت لە گەڵ دوای خۆیدا، بۆیە بەم شێوە دەخوێنرێتەوە:(ارحمن) لەم حاڵەتەشدا زۆر وریای دووبارە بوونەوەی پیتی ڕا دەبین و نابێت تەکراری تێدا درووست بێت و ببێتە : (الررررحمن) ئەوە هەڵەیە، بەڵکو یەک جار سەرەتای زمانت کە دای لە مەخرەجی پیتەکە لە مەڵاشوو ئیتر نابێت لەو جارە زیاتر بجووڵێتەوە بۆ ئەوەی تەکرار نەبێت.

پیتی (ح) سەرەتا وریا ئەبین وەکو قەلقەلە نەیخوێنینەوە ، ئینجا پێویستە بە هەمس دەریبڕین، لە کاتی دەربڕینیدا هەوا دێت و دەڕوا ، سیفەتی هەمس پێچەوانەی سیفەتی جەهرەو وەکو چۆن بە چپە قسەبکەیت دەنگ بەرز نەکەیتەوە ئاوها ئەو پیتە بە هێواشی دەدەچێت..

(الرحمن) مەددێکی طبیعی تێدایە و نابێت لە دوو جووڵە زیاتر درێژبکرێتەوە، مەگەر لە حاڵەتی ڕاوەستان لەسەری ئەو کاتە دەتوانی تاکو شەش حەرەکە لەسەری بوەستیت.

٣- لە کاتی پێکگەیاندنی وشەی (الرحمن) بە (الرحیم) لەبەر ئەوەی ئەلیف و لامی الرحیم شەمسیە وناخوێنرێتەوە وهەمزەکە هەمزەی وەسڵە ، بۆیە وەکو یەک وشە دەخوێنرێتەوە بەم شێوە: (الرحمانرحیم) بەڵام وریای دەربڕینی شەددەی ڕائە کە ئەبین بێ ئەوەی تەکرار بێتەوە.

٤- پیتی (ر) لە هەردوو وشەی الرحمن الرحیم لەبەر ئەوەیە فەتحەی هەیە کەواتە قەڵەو دەخوێنرێتەوەو مفحم ی دەکەین..

بەڵام بە بێ تکرار ودووبارەکردنەوەی پیتی ڕا بە شێوازێک چەندین ڕا دەربکەین لە یەک کاتدا.

٥- زۆر لە خوێنەران هەڵەیەکی تر هەیە لە کۆتایی وشەکانی الرحمن، الرحیم..

تا کۆتایی فاتیحە لە مەددەکان دەیکەن ئەویش بریتیە لە دەربڕینی یائەکە لە گەڵ مینگەدا، یائی الرحیم بۆ نموونە لە لووتیەوە دەردەکات ئەوەش هەڵەیە چونکە ئەو پیتە پەیوەندییەکی بە لووتەوە نییە.

❊❊❊

## ﴿الحمد لله رب العالمين﴾

١-**الحمد:** سەرەتا پێویستە هەوڵ بدەین هەمزەکە بە نزمی بە بچووکی و بە بێ قەڵەو کردن دەربڕین، ئینجا پیتی لام پیتێکە سیفەتی مام ناوەندی تێدایە لە پیتەکانی (لن عمر)ی پێ دەوترێت، واتە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم لەسەری دەوەستین تاکو ئەو مافەی پێ بدەین، یەکێک لەو هەڵانەی خوێنەران لە دەربڕینی ئەم پیتە دەیکەن ئەوەیە قەلقەلەی دەکەن ئەوەش جائیز نییە ، دوایی لە پیتی (ح) وریا دەبیت وەکو خۆی بە جوانی دەربیبڕیت و نەیگۆڕیت بۆ پیتێکی تر وەکو پیتی (ع) بۆ نموونە، سەبارەت بە پیتی میم لە وشەکە پێویستە هەمان کاتی پیتی لام لەسەری بوەستی و قەلقەلەی نەکەیت چونکە ئەوە هەڵەیەکە زۆر لە خوێنەران تێی دەکەون بە هۆی نەوەستانیان لەسەری بۆ ماوەیەکی زۆر کەم..

هەڵەیەکی تر هەیە زۆرێک لە خوێنەران ئەنجامی ئەدەن ئەویش ئەوەیە ضمة (بۆر)ی دالەکە وەکو واو دەخوێننەوە بەم شێوەی لێ دێت: (الحمدو) ئەوەش جائیز نییە و هەڵەیەکی ئاشکرایە کە لای زانایان بە (اللحن الجلي) ناودەبرێت

٢- **لله:** لەبەر ئەوەی پیتی لام لەسەرەتای ناوی مەزنی الله کەسرەی هەیە کەواتە بە ناسکی دەیخوێنینەوە، دووبارە دەڵێم وریای ئەوە دەبین لامەکەی لە پێویست زیاتر درێژی نەکەینەوە چونکە دەبێتە (مط)وئەوەش وەکو ابن الجزري فەرموویەتی جائیز نییە، ئەلیفەکەشی نابێت لە دووجووڵە زیاتر درێژ بکرێتەوە کە (مد طبيعي) پێ دەوترێت ، بەڵام ئەگەر لەسەری

ڕاوەستاین لەو حاڵەتهدا دەتوانین ٢ یان ٤ یان ٦ جووڵە درێژی بکەینەوە چونکە دەبێتە (مد عارض للسکون) .

زۆر گرنگە پیتی هائەکەشی بە جوانی دەربڕین ،چونکە زۆر جار خوێنەران قووتی ئەدەن! یان دەیگۆڕن بۆ پیتی یاء ئەوەش جائیز نییە.

٣- **رب**: پێش هەمووشتێک پێویستە ڕائەکە بە (مفخم) ی دەربڕین و قەڵەوی بکەین چونکە فەتحەی لەسەرە، نابێت بەناسکی بخوێنرێتەوە، بائەکەشی پێویستە سیفەتی شیددەی تێدا جێگیر بکەین ونەهێڵین هەوا لەگەڵ دەربڕینیدا بێت و بڕوات، ئەگینا وەکو پیتی (پ) ی کوردی دەبیسترێت.

٤- لە کاتی بە یەکگەیاندنی رب لە گەڵ العالمین وریای کەسرەی وشەی رب دەبین قووت نەدرێت واختلاس نەکرێت ، هاوکات درێژیش نەکرێتەوە ببێتە یاء، ئەمە تێبینیەکی زۆر گرنگە.

٥- **العالمین**: هەمزەکە بە جوانی پێویستە دەربڕین لە مەخرەجی خۆیەوە لە (اقصی لحلق)وە . لامەکەی قەمەریە زۆر وریا دەبین قەلقەلەی نەکەین بەڵکو بۆ ماوەیەکی زۆر کەم لەسەری بوەستین بۆ ئەوەی مافی (توسط)کەی پێ بدەین، پیتی عەین وەکو خۆی بەجوانی دەریدەبڕین و نایگۆڕین بۆ هیچ پیتێکی تر وەکو (ح ) بۆ نموونە. پاشان ئەلیفەکەی مەددێکی طبیعي تێدایە تەنها دوو جووڵەیە نابێت لەوە زیاد بکرێت.. بێگومان لامەکەشی فەتحەی لەسەرە هەر بەو شێوە دەیخوێنینەوە ،دوای

ئەوە ڕەچاوی ئەوە دەکەین کە یائەکە مەددێکی طبیعی تێدایە ٢ جووڵەیە لەبەر ئەوەی کەوتووەتە کۆتایی وشەکە ئەویش وەکو حاڵەتەکانی پێشوو دەکرێت تاکو شەش حەرەکە درێژ بکرێتەوە ،سەبارەت بە پیتی نوونیش لە العالمین مینگەیەکی زۆر کورتی تێدایە پێی دەوترێت (غنة انقص ماتکون) بۆ ئەوەی ببیسترێت و قووت نەدرێت ، ئەگینا ئەگەر ئەو مینگەیە نەبێت کە خۆی لە بنچینەدا سیفەتێکی وابەستەی نوون ومیمە بەم شێوە دەچێتەگوێی بیسەردا: العالمی...واتە: نونەکەی نابیسترێت.

٦- **الرحمن الرحیم**: حوکمەکانیمان باس کرد لەگەڵ (بسم الرحمن الرحیم) لە بابەتی البسملة والحمد لله رب العالمین.

❊ ❊ ❊

## ﴿ملك يوم الدين﴾

سەبارەت بە حوکمە تەجویدییەکانی ئەم ئایەتە لەسورەتی الفاتحة، دەڵێین:

١- **ملک** : سەرەتا وەکو وشە بەو شێوە لە موسحەفدا دەنووسرێت بەڵام بە پێی ڕیوایەتی حفص بە مالک دەخوێنرێتەوە.

٢- پیتی ئەلیف لە وشەکەدا مەددێکی طبیعي تێدایە و تەنها دوو جووڵە درێژ دەکرێتەوە نەک زیاتر، گرنگە بایەخ بدرێتە دەرخستنی کەسرەی لامەکە نەوەک اختلاس بکرێت، لەوەش گرنگتر کەسرەی کافی وشەی مالک درێژ نەکرێتەوە چونکە واتاکە دەشێوێنێ لە یەک مالیکەوە دەبیتە فرە مالیک والعیاذ بالله ، بۆیە پێویستە ئەو کەسرە بە هیچ شێوەیەک لە حەددی خۆی زیاتر درێژ نەکرێتەوە.

**یوم:** یائی سەرەتا دیارە کە مەددی نییە چونکە ساکن نییە بە ئاسایی لە مەخرەجی خۆیەوە دەریدەبڕین، واوەکە مەددی لینە چونکە خۆی ساکینەو پیتی پێش خۆی مەفتوحە، بەڵام لە حاڵەتێکدا ئەگەر لەسەر وشەکە ڕاوەستاین، ئەگەر نا مەددی تێدا نییە ، لە میمی یوم وریای کەسرەکەی دەبین اختلاس نەبێت و بە جوانی دەریبڕین.

٣- **یوم:** لە میمی کۆتایی یوم ، یەکسەر دەچینە سەر خوێندنەوەی پیتی دال لە وشەی الدين چونکە لامی وشەی الدين شەمسیە و ناخوێنرێتەوە بۆیە وەکو ئەوەی بەم شێوە بێت دەیخوێنیتەوە: (یومدین).

پیتی دال: شەدداره واتە: دوو داله یەکەمیان ساکینه ودووەمیان مەفتوحه ، یائی وشەی الدین یائێکی مەددیه و دوو حەرەکه درێژکردنەوەی تێدایه، بەڵام بە هۆی ڕاوەستانەوه که پێی دەوترێت المد العارض للسکون تاکو شەش حەرەکەش خوێنەر دەتوانێت درێژی بکاتەوە.

پیتی نون له وشەی الدین مینگەیەکی زۆر کورتی تێدایه پێی دەوترێت (انقص ما تکون) بۆ ئەوەی له کاتی خوێندنەوه ببیسرێت.

❊ ❊ ❊

## ﴿إياك نعبد و إياك نستعين﴾

لەم بەشەی ڕوونکردنەوەی سورەتی الفاتحة لە ڕووی حوکمەکانی تەجویدەوە باسی حوکمەکانی جوانخوێندنەوەی ئایەتی ﴿اياک نعبد واياک نستعين﴾ دەکەین وبە یارمەتی پەروەردگار دەڵێین:

١- **اياك**: پێویستە هەمزەکەی بە محقق ی لە جێگەی دەرچوونی خۆیەوە لە ئەوپەڕی قورگەوە دەرکرێت. ئینجا بزانی کەپیتی یاء شەدداره واتە: دوو یائە، ساکن و مفتوح، بۆیە بەجوانی شەددەکەی دەردەبڕین و لەوە خۆمان دەپارێزین بێ شەددە وەکویائێکی فەتحەدار بیخوێنینەوە یان (مط) بکرێت زیادلە ئاستی خۆی درێژ نەکرێتەوە. ئەلیفەکەش پیتێکی مەددیە دوو جووڵە زیاتری پێ نادرێ مەگەر لەحاڵەتێکدا لەسەرپیتەکە بوەستین ئەوە دەبێتە االمد العارض للسكون.

٢- **نعبد**: پیتی عەین سیفەتی (التوسط) ی تێدایە واتە: پیتێکی مام ناوەندییە لە نێوان (الرخاوة و الشدة) دا، بۆیە بۆساتێکی زۆر کەم لەسەری ڕادەوەستین ولە قەلقەلە کردنی ودرێژکردنەوەی زیاد لەئاستی خۆی خۆمان دەپارێزین. بۆری بائەکە بەجوانی دەردەکەین، هەروەها بۆری دالەکەش وریا ئەبین لەدرێژکردنەوەی بۆئەوەی نەبێتە: نعبدو.

٣-**اياك**: ی دووەم وەکو اياک ی یەکەمە.

٤- پیتەکانی (نستعين) هەمووی (مستفل) ن واتە: نزمن و پێویستە قەڵەو نەخوێنرێنەوە، سینەکە دەنگێکی تایبەتی تیژی تێدایە وەکو دەنگی کوللە (صفير) ی پێدەوترێت ئەگەر ئەوسینە بە هەڵە قەڵەوبکرێتەوە ئیتر تائەکەی پاش خۆیشی وەکو پیتی ط دەردەچێت.

## ﴿إهدنا الصراط المستقيم﴾

لەم ئایەتەدا لە سورەتی (الفاتحة) چەند ڕاوەستانێکمان دەبێت:

١- تەحقیقی دەربڕینی هەمزەکە زۆر گرنگە لە مەخرەجی خۆیەوە بێت و لە گەڵ پیتی ها تێکەڵ نەکرێت چونکە مەخرەجەکانیان زۆر لە یەکترەوە نزیکن، هەیە وەکو (ایدنا) یان (یهدنا) دەیخوێنێتەوە ئەوەش هەڵەیەکی (جلي) پێی دەوترێت، ئینجا کەسرەی دالەکە پێویستە بە جوانی بخوێنرێتەوە واتە (اختلاس) نەکرێت.

٢- لە نونی (اهدنا) ڕاستەوخۆ دەچینە سەر صادی (الصراط) بەم شێوە (اهدنصراط) چونکەی هەمزەکەی هەمزەی وصل ە و لامەکەشی شەمسیە ناخوێنرێتەوە، خوێنەران بەهەڵە صادەکە دەکەنە سین واتە: السراط یان دەیکەنە السرات ئەوەش هەڵەیە..پیتی ڕا لە الصراط (مفخم) ە پێویستە بەقەڵەوی بخوێنرێتەوە ، ئەلیفەکەشی مەددێکی طبیعي تێدایە نابێت لە دوو حەرەکە زیاتر درێژ بکرێتەوە، زۆر لە خوێنەران دەکەونە هەڵەی درێژکردنەوەی بۆ زیاتر لە دوو حەرەکە، ئینجا پیتی ط بە بەرزی و گەورەیی دەرکرێت و نەکرێتە پیتی ت.

٣- **المستقیم**: سەرەتا تەحقیقی هەمزەکە ئەوە زۆر گرنگە، ئینجا لامەکە قەمەریە و بە جوانی و سیفەتی مامناوەندییەوە دەخوێنرێتەوە چونکە یەکێکە لە پیتەکانی (لن عمر)، ئینجا پێویستە گرنگی بدەینە بۆری سەر میمەکە، ئینجا سیفەتی (الصفیر) لە سینەکە لە بیر نەکەین ئەوە زۆر گرنگە، لەوەش وریا ئەبین پیتی ت بگۆڕین بۆ پیتی ط واتە نەبێتە (المسطقیم) پیتی قاف یەکێکە لەپیتەکانی (الاستعلاء) واتە:پیتە بەرزەکان بەڵام لێرە کەسرەی هەیە و نزمترین پلەکانی بەرزیدایە بەڵام هەربەرزە بۆیەکاریگەری دەخاتەسەر پیتەکانی پێش خۆی و وەکو وتم جاری واهەیە خوێنەر بە (المصطقیم) دەیخوێنێتەوە.

❊ ❊ ❊

## ﴿صراط الذين أنعمت عليهم﴾

١- وشەی **صراط**: پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکەیت پیتی صاد لە سەرەتاکەی پیتێکی بەرزە هەرچەند کەسرەشی لە ژێرە ، بۆیە لەوە خۆمان دەپارێزین بیگۆڕین بۆ پیتی س وبە سراط یان سرات نەیخوێنینەوە! ئەلیفەکەشی پیتێکی مەددیە واتە دووحەرەکەدرێژ دەکرێتەوە نەک زیاتر مەگەر لە کاتێکدا لەسەر وشەکە ڕاوەستیت کەخۆی جێگای ڕاوەستانیش نییە ئەو کاتە دەبێتە (وقف عارض للسكون). پیتی ط لەکۆتایی وشەکهدا یەکێکە لە پیتەکانی (استعلاء) وپێویستە بە بەرزی وبەقەڵەوی دەریبڕینن بەناسکی وەکو پیتی تا.

٢- **الذين**: وریا ئەبیت لە کاتی دەرچوون لە پیتی ط لە (الصراط) و خوێندنەوەی (الذين) لامەکەی قەڵەونەکەیتەوە زورێک لە خوێنەران وپێشنوێژان ئەوهەڵە ئەنجام دەدەن هۆکاریشی بەرزی وگەورەیی پیتی طائە کاریگەری دەخاتە سەر لامەکە، پیتی ذ پێویستە زۆر وریای بین لە مەخرەجی خۆیەوە لەسەرەتای زمانەوە دەریبکەین وسیفەتی نەرمی الرخاوەی پێ بدەین ونەهێڵین ببێتە (اللزين) زۆر لەخوێنەران ئەو هەڵە ئەنجام ئەدەن ئەوەش جائیز نییە پێی دەوترێت (لحن جلي) واتە:هەڵەی ئاشکرا، پیتي یا لە الذين مەددیەو دوو حەرەکەی پێ دەدرێت نەک زیاترا! مەگەر لەکاتی ڕاوەستان لەسەری ئەو کاتە تاکو شەش حەرەکە دەکرێت درێژبکرێتەوە چونکە دەبێتە (المد العارض للسكون.)

٤- **انعمت**: هەمزەکەی هەمزەی دابڕانە ودەخوێنرێتەوە ئەگەر بدرێتە دەم پیتی پێش خۆیەوە، هەردوو پیتی نون ومیم لە وشەکە سیفەتێکیان تێدایە پێی دەوترێت (البینیة) یان (التوسط) واتە نە (رخو )ونە (شدید) ن ،جا یەک زەمەنیان هەیە بۆ دەربڕین پێویستە ئەومافەیان ڕەچاو بکرێت، لە قەلقەلە کردنیشیان پێویستە خوێنەر زۆر وریا بێت زۆرێک لە خوێنەران ئەو هەڵە ئەنجام ئەدەن وەکو ئەوەی فەتحەیەکی لەسەر بێت دەیخوێنێتەوە!

٥- **علیهم**: پیتی عەین لەمەخرەجی خۆیەوە لەقوڵاوی قورگەوە پێویستە دەربکرێت، یائەکە لەبەر ئەوەی ساکینەو پیتی پێش خۆی فەتحەدارە پێویستە ڕەچاوی ئەوەبکرێت، سەبارەت بە پیتی ها گرنگەکەسرەکەی دەربڕین و نەیکەینە یا چونکە کەسرە درێژ بکرێتەوە دەبێتە یا پێچەوانەکەش ڕاستە!پیتی میمیش لە کۆتایی وشەکە (اظهار) دەکرێت لە بنەڕەتیشدا مینگەیەکی زۆر کورتی تێدایە ئەگەر ئەنجامی نەدەیت پیتەکە بیستراو نابێت.

❊ ❊ ❊

## ﴿غير المغضوب عليهم﴾

لەم بەشەدا تەنها باسی ئەم سێ وشە دەکەین لە ڕووی ئاشنابوون بە حوکمەکانی تەجویدەوە:

١- غیر: پیتی غ پیتێکی بەرزە لە پیتەکانی (خص ضغط قظ)، زۆر لە خوێنەران بە هۆی نزمیی پیتی یاء لە دوای خۆیەوە نزمی دەکەنەوە ئەوەش هەڵەیەکی نادیارە پێی دەوترێت (لحن خفي) یائەکە ساکینە لەناوەڕاستی ناودەمەوە دەردەچێت هاوکات پیتێکە لەپیتەکانی (مد اللين) و لە کاتی ڕاوەستان لەسەر پیتی غیر تا شەش جوڵە درێژدەکرێتەوە.

٢- المغضوب: سەرەتا گرنگە هەمزەکە بە محقق ی بخوێنرێتەوە، لامەکە قەمەریە و دەخوێنرێتەوە وبۆ ماوەیەکی زۆرکەم دەبێت لەسەری ڕاوەستیت بۆ ئەوەی سیفەتی التوسط ی تێدا جێبەجێ بکەیت وقەلقەلە نەکرێت، میمەکە پیتێکی نزمە وریا دەبین بە هۆی پیتی ضادی پاش خۆی کە بەرزە ئەویش بەرز نەبێتەوە.

خوێنەران لە دەربڕینی پیتی ضادەکە دەکەونە هەڵەی جۆراوجۆرەوە، هەیانە بە زای دەیخوێنێتەوە (المغزوب) .هەیانەبە دال دەیخوێنێتەوە (المغدوب) هەیانە بە لامی قەڵەو دەیخوێننەوە (المغلّوب)یان بەهەر شێوازێکی تر هەڵەیە جگە لە پیتی (ضاد)ی هاوشێوەی صاد کە (اخت الصاد)ی پێ دەوترێت.

٣- علیهم: جەخت دەکرێتەوە لەسەر دەرکردنی پیتی عەین لە جێگای دەرچوونی خۆیەوە لە قوڵایی گەروو، وریاش دەبین بەپیتی ح نەبگۆڕین چونکە مەخرەجیان لەیەکترەوە نزیکە، پیتی یاء مەددی لینی تێدایە چونکە خۆی ساکینە وپێش خۆیشی پیتێکی فەتحەدارە، بەڵام لێرە لەبەر ئەوەی کەوتووەتە ناوڕاستی وشە کاریگەری نییە، پیتی ها پێویستە تەحقیقی بکەین ولە جێگەی ڕاستی خۆیەوە دەریبکەین و نەیگۆڕین بۆ هیچ پیتێکی تر، لە کۆتاییشدا پیتی میم پێویستە ئەو مینگە زۆر کەمەی کە تێیدایە دەریبڕین بۆ ئەوەی بیستراو بێت و پێی دەوترێت (غنة انقص ما تكون).

❊ ❊ ❊

## ﴿ولا الضالين﴾

ئەم دوو وشە بەشی کۆتاییە لە باسکردنی حوکمەکانی تەجوید لە سورەتی الفاتحة:

١- **ولا**: پیتی واوەکە بەناسکی وبچووکی دەخوێنرێتەوە چونکە (مرقق)ە و نابێت بە (مفخم) ی واتە بە قەڵەوی بخوێنرێتەوە، لامەکە بە هەمان شێوە بە بچووکی وبەناسکی دەخوێنرێتەوە چونکە ئەویش مرقق ە.

٢- **الضالين**: لەبەر ئەوەی ئەلیفەکەی ئەلیفی وەصڵەو ناخوێنرێتەوە، لامەکەشی شەمسیەو ناخوێنرێتەوە، بۆیە لە لامی ولا ڕاستەوخۆ دەچینە سەر ضادی الضالين و دەڵێین: ولضالين! پیتی ضاد پیتێکی زۆر گرانە لە دەربڕیندا و بۆ ئەوەی ڕاست بخوێنرێنەوە پێویستە دوو سیفەتی تێدا جێبەجێ بکەیت:

یەکەم: سیفەتی (الإستطالة) کە بریتیە لەدرێژی جێگای دەرچوونی پیتەکە و لە مەخرەجی خۆیەوە تاکو مەخرەجی پیتی لام درێژ دەبێتەوە.

**دووەم**: ناسینی شوێنی دەرچوونی کە بریتیە لە لێواری زمان لەلای چەپ یان لەلای ڕاستیشەوە دەبێت بەڵام گرانترە لە گەڵ دانەکانی سەرەوە، هاوکات پێدانی سیفەتی ڕەخاوە کە دەبێتە مایەی بیسرانی دەنگێکی تایبەت بەو پیتەوە. خوێنەران زۆرهەڵە لەدەربڕینی ئەم پیتە دەکەن، وەکو خوێندنەوەی بە:

- الظالين: واتە لەمەخرەجی الحروف اللثوية وسەرەتای زمانیان لە کاتی دەربڕینیدا دێتەدەرەوە ئەوەش هەڵەیەکی ئاشکرایە (لحن جلي).
- الدالين: وەکو دالێکی قەڵەو دەیخوێننەوە ئەوەش هەڵەیە.

- یان وەکو پیتێکی تێکەڵ لە نێوان زای و ظاء وەکو ئەوەی لەزمانی کوردیدا بۆنموونە وشەی ضابط یان ناوی کاظم دەردەبڕدریت!

الزالين: هەڵەیەکی ئاشکرایە

- الطالين: دەرکردنی لە مەخرەجی الحروف النطعية ئەوەش هەر هەڵەیەکی ئاشکرایە.

- ئەلیفەکە یەکێکە لە پیتەکانی مەدد ، لەبەر ئەوەش ساکینێکی صحیح ی بە دوادا هاتووە کە لامی یەکەمی لامە شەددارەکەیە، کەواتە مەددێکی درێژی شەش جووڵەییمان بۆ درووست دەبێت کە پێی دەوترێت (المد اللازم الكلمي المثقل).

**تێبینی:** لامەکەی بریتیە لە دوو لام یەکەمیان ساکینە ودووەمیان فەتحەی لەسەرە.

پیتی یائی پێش کۆتایی بریتیە لە مەددێکی طبيعي دوو حەرەکەی پێ دەدرێت، بەڵام بە هۆی ڕاوەستانەوە دەبێتە المد العارض للسكون و تا شەش حەرەکە جائیزە درێژکرێتەوە.

نوونی کۆتایی بەسروشتی خۆی مینگەیەکی تێدایە لێرە لەبەر ئەوەی ساکینە زۆر بەکورتی دەریدەبڕین ئەوەندەی کەپیتەکە ببیسترێت ولە نێو نەچێت.

**تێبینی:** ناکرێت وشەیەکی گرانی وەکو ولا الضالين، بەڵکو تەجوید بەگشتی بە بێ مامۆستا کەسێک بتوانێت لە خۆیەوە فێری ببێت. والحمدلله رب العالمين.

## ﴿آمين﴾

هەرچەند ئامین ئایەتێک نییە لە سورەتی الفاتحة بەڵام لەبەر ئەوەی سوننەتە لە کۆتایی سورەتەکەدا بوەترێت بە کورتی باسی ئەویش دەکەین:

وشەی ئامین واتە:یا الله وەڵاممان بدەرەوە و دوعامان گیرا بکە.

وتنی سوننەتە لەپاش فاتیحە لە ناو نوێژ و دەرەوەی نوێژ وبۆ پێشنوێژ و مەئموم وەکو ابن کثیر فەرموویەتی: (يُسْتَحَبُّ لِمَنْ قَرَأَ الْفَاتِحَةَ أَنْ يَقُولَ بَعْدَهَا: آمِينَ قَالَ أَصْحَابُنَا وَغَيْرُهُمْ: وَيُسْتَحَبُّ ذَلِكَ لِمَنْ هُوَ خَارِجُ الصَّلَاةِ، وَيَتَأَكَّدُ فِي حَقِّ الْمُصَلِّي، وَسَوَاءٌ كَانَ مُنْفَرِدًا أَوْ إِمَامًا أَوْ مَأْمُومًا، وَفِي جَمِيعِ الْأَحْوَالِ " انتهى من)[١]

وەکو حوکمی تەجویدی وشەکە دەکرێت بڵێین:

پیتی یەکەم آ مەددی بەدەلی تێدایە لەڕیوایەتی حفص کە خۆمان پێی دەخوێنین تەنها دوو حەرەکە درێژ دەکریتەوە ،بەڵام بەپێی ڕیوایەتی وەرش لە قیرائەتی نافع تا شەش حەرەکە درێژ دەکرێتەوە!

میمەکەی کەسرەی لە ژێرە، یائەکەش مەددی طبيعي تێدایە دووحەرەکەیە، بەڵام لە کاتی ڕاوەستاندا دەبێتە (المد العارض للسكون) و شەش حەرەکە درێژ دەکریتەوە، نوونەکەش لە کۆتاییدا پێویستە (اظهار) بکرێت و مینگەیەکی زۆر کورتی تێدایەپێی دەوترێت (غنة انقص ما تكون).

[١] - تفسير ابن كثير" (١/ ١٤٤-١٤٥).

# کۆتایی

سوپاس بۆ الله لەسەر ئامادە کردنی ئەم کتێبە و داواکارم بیکاتە مایەی سوود و خێر و پاداشت بۆ نووسەر و خوینەر و هەرکێ بەشدار دەبێت لە بڵاو کردنەوەیدا، باس و ناوەڕۆکی سەرەکی ئەم کتێبە لەم چەند خالەی خوارەدا خۆی دەبینیتەوە:

- جەخت کردنەوە لەسەر گرنگیدان بە پەیامی تەوحید لە قورئانی پیرۆزدا.

- جەخت کردنەوە لەسەر گرنگی زانستی تەجوید و قیرائاتی قورئانیی بەبێ ئەوەی خۆی لە خۆیدا ببێتە ئامانج، بەڵکو پێویستە وەکو هۆکارێک بۆ تێگەیشتنی قورئانی پیرۆز و تدبر کردنی وێنا بکرێت.

- پێویستە خوێنەری قورئان و فێرخوازی زانستەکانی قورئانی پیرۆز وریا بێت نەکەوێتە ناو مەترسی ڕوپامایی و وانە لە ژیاننامەی زانایانی سەلەف فێر بێت لە بواری زوهد و شارنەوەی چاکەکانی خۆیدا و هەروەها ئەوەشیان لێ فێر ببێت کە عەقیدەو تەوحید بنەماو بنچینەی هەموو کردەوەیەکن و بەبێ ئیمانێکی سەلامەت و دوور کەوتنەوە لە هەموو شیرک و بیدعەیەک کردەوەکان وەرناگیرێن.ش

- هەروەها لەم کتێبەدا کۆمەڵێک باسی تایبەت بە تەجوید و بە ئیجازەی قورئانی لە خۆ گرتووە و وەڵامی کۆمەڵێکی پرسیاری شەرعی تایبەت بەو بوارەی تێدا دراوەتەوە.

## ناوەڕۆک